www.alibapir.com

زنجیرەی ئاگایی ١٧

# سەرکردایەتی کردن لە ئیسلام دا

# چییە و چۆنە ؟!




عەلی باپیر

١٤٤٢ ك ٢٠٢١ ز

# سەرکردایەتی کردن لە ئیسلام دا
# چییە و چۆنە؟!


ناوی نووسەر: عەلی باپیر

دیزاین : جمعە صدیق کاکە

خەت : نەوزاد کۆیی

نۆبەتی چاپ : یەکەم ١٤٤٢– ٢٠٢١

تیراژ : ١٠٠٠ دانە




## ناوەندی راهێنان و گەشە پێدان

ناوەندێکە، لە پەیڕەوی نێوخۆی پەسندکراوی کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان/عێراق ساڵی ٢٠١٥ وەکو یەکێك لە ئۆرگانە فەرمییەکانی حزب بڕیاری لەسەر دراوە و جێگیرکراوە، ئەرکە سەرەکییەکەی بریتییە لە گرنگیدان بە پەرەپێدانی تواناکان و پێگەیاندنی ئەندامان لە بوارە جیا جیاکان و، بایەخدان بە بواری رۆشنبیری و راهێنان و گەشەپێدانی توانستەکانیان، بەمەبەستی دروستکردنی کادیر و سەرکردەی داهاتوو لە کایەی حزبی و حکومیدا.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا
ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ
تَعۡمَلُونَ ١٠٥ ﴾

المائدة: ١٠٥

# پێشکەش بێ

بە ئەندامە دڵسۆز و مشوورخۆرەکانی
کۆمەڵی ئیسلامیی بەگشتیی و،
بە تایبەت ئەوانەی هەرچی زیاتر کار
لەسەر باشتر تێگەیشتن و چاکتر
پێگەیشتنی خۆیان دەکەن...

# پێشەكی
# ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان

ناوەنـد دەمێكـە لـە بـیری ئـەوەدابوو بـۆ ژمـارە تـازەی زنجیرەی (ئاگایی)، بابەتێكی هەستیار و گرنگ و پێویسـت بـۆ ئـەم قۆناغـەی كـاری (دەعـەوی و سیاسـی و ڕێكخراوەیـی) هەڵبـژێرێت، ئـەوەبوو دواجـار بابـەتی (سـەركردایەتییكردن)ی دەستنیشـانكرد و لـە چوارچـێوەی پڕۆژەیـەكی سـەربەخۆدا پێشكەشـی جـەنابی ئـەمیر مامۆسـتا (عـەلی بـاپیر) كـرد، بەڕێزیشیان بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بیرۆكـەی ئـەم پڕۆژەیـەی لەلا پەسند بوو، دواتر زۆر بەخەستی كاری لەسەر كرد و كـاتی زۆری بـۆ تـەرخان كـرد، تـاكو ئـەو بابەتـە لـە دووتـوێی ئـەم زنجیرەیەدا هاتە بەرهەم.

سەرکردایەتیی و پێشەوایەتیی کردن لە بنەڕەتدا ڕاسپاردە و خزمەت کردنە، نەك شانازیی کردن و خۆ بە زل زانین، واتە سەرکردایەتییکردن بریتی نیە لە پلە و پۆستەکان بەڵکو بریتیە لە بەکارهێنانی پلە و پۆست لە پێناو خزمەت کردنی خەڵکیدا، نەخاسمە بۆ جەمعێکی ئیسلامیی کە بەکاری دەعەویی و سیاسی و رێکخراوەییەوە خەریکن، دەبێ چەند بە جیددیی و بەرپرسیاریەتییەوە مامەڵەی دروستی لەگەڵ بکرێ و بزانێت چۆن لە خزمەت پەیامە پیرۆزەکەی و خەڵکی دەوروبەری بەکاری دەهێنێت.

بە حوکمی ئەوەی ئێستا کۆمەڵی ئیسلامیی حزبێکی ڕەسەن و خاوەن پێگەیەکی بەهێزی جەماوەرییە و لە قۆناغی گەشەکردن و بەهێزبوونی خۆیدایە، لەبەر ئەوە لە هەموو کات زیاتر پێویستی بە سەرکردایەتییەکی لێزان و شایستە و لێهاتوو هەیە کە بتوانێت هەم جڵەوی ئەم قۆناغە بە سەرکەوتوویی بگرێتە دەست و، هەمیش ئەرکی بەرپرسیارییەتیی قۆناغەکە بە لێهاتوویی بخاتە سەر ئەستۆی خۆی و ڕووێکی جوانی حزب نیشانی دەرەوە بدات و، بۆ هەموو لایەك بسەلمێنێت کە سەرکردەکانی کۆمەڵ بە خاوەن روئیای قووڵ و پڕاوپڕبوونیان لە دڵسۆزی و هەڵوێستی بوێرانە

و خۆنەویستییان، قۆڵی کارکردن و خزمەت کردنیان هەڵماڵیوە.

لە سۆنگەی هەستیاری و گرنگی بابەتی سەرکردە و سەرکردایەتییکردن، بە پێویستمان زانی وەك ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان دید و تێڕوانینی جەنابی مامۆستا عەلی باپیر لەسەر چەمکی (سەرکردە) و (سەرکردایەتییکردن) لە نزیکەوە بزانین، بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)،و زانستەکانی سەردەم و بۆچوونی زانا و بیرمەندە هاوچەرخەکان، خوێندنەوەیەکی وردی بۆبکات و، گرنگترینی ئەو پێوەر و مەرجانە بخاتەڕوو کە سەرکردەی شایستە بەرهەم دێنێ و سەرکردایەتییکردنێکی ڕاستەقینەی لەسەر بونیاد دەنرێت، تا لە دەرەنجامدا هەموولا بە بەرچاوڕوونی و ئاگایی و هۆشیارییەوە مامەڵەی ئەم چەمکە بکەین و مافی شایستەی خۆی پێ بدەین و، لە داهاتووشدا ئەم بابەتەی مامۆستا، کە لە بنەڕەتدا بەرهەمی ئەو خولە بوو کە ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان بەهەماهەنگی لەگەڵ ڕاگەیاندنی مەکتەبی ئەمیر لە ڕێگای ئۆنلاینەوە بۆ ئەندامانی ئەو گرووپەی دامانمەزراندووە، بەناوی گرووپی ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان ئەنجامیدا، کە پێنج (٥) وانەی چڕو پڕی تیادا گوترایەوە، جا دوای

نووسینەوەو دەستکاریی کردن و دەوڵەمەندتر کردنی، لە دووتوێی ئەم زنجیرەیە بە چاپ گەیەنرا، وەك مەنهەجێکی نێوخۆیی و سەربەخۆ سوودی لێ ببینرێت لە ڕاهێنان و ئامادەکردنی سەرکردەی شایستە و سەرکردایەتییکردنێکی ڕاست و دروست دا.

ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان

٢٠٢٠/١٢/٢٥

# پێشەکی و ڕێخۆشکردن

الحمدلله رب العالمین، و صلی الله تعالی وسلم علی محمد خاتم النبیین، المبعوث رحمة للعالمین، وآله أجمعین من الصحب و الأزواج و القرابة و التابعین لهم بإحسان الی یوم الدین.

خوێنەری سەنگین!

ئەم کتێبەی بەردەستت لە ئەسڵ دا کۆی پێنج وتاری بەندە بووە لە ژێر ناوونیشانی: (سەرکردایەتییکردن و مەرجەکانی)دا بۆ ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامیی، لە ڕێی ئینتەرنێتەوە بە ئۆنلاین، پێشکەشکراون[1].

شایانی باسیشە: پێشنیارکردنی بابەتەکە و، دوایی زەمینەسازکردنی پێشکەشکرانیشی و، دواتر هێنانە سەر

---

١) لە شەوەکانی: ٢٨/٢٩/ ١١و ٢٩/٣٠/١١ و ٣٠/٣١/١١/٢٠٢٠ز دا.

کاغـەز و تاپیکردنیشـی، لەلایـەن: ناوەنـدی ڕاهێنـان و گەشـەپێدانی کۆمـەڵی ئیسـلامییەوە بـوو، بۆیـە سوپاسـیان دەکـەم و، لـە خـوای میهرەبـان داواکـارم بـە باشـترین شـێوە پاداشتیان بداتەوە.

ڕوون و بـێ چـەند و چوونیشـە کـە (هونـەری سەرکردایەتییکردن) هەتا بڵێی بابەتێکی گرنگ و هەستیارە و جێـی خۆیـەتی زۆر سـەرنج بـدرێ و لێکۆڵینـەوەی لـە بـارەوە بکرێ و، بەهرەش لە کۆی ئەزموونگەلی خەڵك وەرگیرێ، وەك بـەردەوام لێکۆڵـەرەوە مسـوڵمانەکان لـە بـواری حـوکمڕانیی و سیاسەتی شەرعییدا هـەروایان کـردوە و، بـە پێـی فەرمایشـتی خوا: ﴿فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ ۚ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ ۖ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿١٨﴾﴾ الزمر (١٨).

واتە: موژدە بدە بەو بەندانەم کە گوێ بۆ هـەموو قسـەیەك دەگـرن، ئنجـا شـوێن باشـترینی دەکـەون، ئـا ئـەوان خـوا خستوونیە سەر ڕێی ڕاست و ئەوانە خاوەن عەقڵانن.

هـەروەها بـە پێـی دەقـی: (الحكمةُ ضالَّةُ المؤمنِ فحيثما وجدها فهو أحقُّ بها)[1]. واتە: حیکمـەت ونبـووی بـڕوادارە لـە هەر جێیەك بیدۆزێتەوە پێی شایستەترە، مامەڵەیان کردوە.

---

١) رواه الترمذي: ٢٦٨٧.

منیش لەم کتێبەم دا – کە پێشتر پێنج وتار بووە – هەر بەو جۆرە مامەڵەم کردوە و ، هیواداریشم نیشانەم تێدا پێکابێ و، ئامانجم هێنابێتەدی.

کۆی ئەم بابەتەشمان بۆ سێزدە (١٣) تەوەر دابەشکردوە، کە ئەمانەن:

تەوەری یەکەم: پێناسەکردنی سەرکردایەتییکردن و سەرکردە.

تەوەری دووەم: گرنگیی و پێویستیی هەبوونی سەرکردایەتیی.

تەوەری سێیەم: بیردۆزە گرنگەکانی سەرکردایەتیی و سەرکردە.

تەوەری چوارەم: خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی سەرکردە و ئەرکە گرنگەکانی.

تەوەری پێنجەم: تایبەتمەندییەکانی سەرکردەی سەرکەوتوو.

تەوەری شەشەم: شوێنەوار و بەرهەمەکانی سەرکردایەتیی باش.

تەوەری حەوتەم: نیشانەکانی مرۆڤی شایستەی سەرکردایەتیی.

تەوەری هەشتەم: بنەماکانی ئامادەکردنی سەرکردەکان.

تەوەری نۆیەم: ڕۆڵی دامەزراوەکانی کۆمەڵگا لە پێگەیاندنی سەرکردەدا.

تەوەری دەیەم: کۆسپ و پەرچە خودیی و دەرەکییەکانی پێگەیشتنی سەرکردە.

تەوەری یازدەیەم: ئەو خەسڵەتە خراپانەی پێویستە سەرکردە خۆیانی لێ بپارێزێت.

تەوەری دوازدەیەم: چەند بنەمایەکی قورئانیی بۆ سەرکردایەتییکردن.

تەوەری سێزدەیەم: ئەزموونی خۆم لە بواری سەرکردایەتییکردن دا.

ئامادەکردنی ئەم بابەتەش، دوو سێ هەفتە سەرگەرمی تێفیکرین و موتالا بووم و، جگە لە سەرنج دان و تێوەڕامانی قورئان و سوننەت و سیرەی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەوری سی (٣٠) کتێب و سەرچاوەشم تەماشاکردوون، کە لە بواری سەرکردایەتییکردن دا نووسراون، کە زۆربەیان لەلایەن زانا و لێکۆڵەرە ڕۆژئاواییەکانەوە نووسراون و، هەندێکیشیان لەلایەن زانا و شارەزایانی مسوڵمانەوە.

دەتوانین وەك نموونـە ئامـاژە بـە چـواریان بـدەین، كـە لـە هەموویان زیاتر بەهرەمەند بووم بە پێی ڕیزبەندییان:

١- إعداد القادة، رؤية دعوية معاصرة، عادل عبـدالله هنـدي، ط١/ ١٤٣٩هـ - ٢٠١٨م.

٢- المنهج المتكامـل لإعـداد القـادة، الجـزء الأول: مفـاهيم و أساسيات القيـادة، د. طـارق محمـد السـويدان و أ.غيـاث خليل الهواري، ط ١/ ٢٠١٨م. ص ٣٢٩

٣- سحر القيادة، د. إبراهيم الفقي، ط١/ ٢٠١٨م.

٤- القيادة الإدارية في الإسلام، عبدالشافي محمد أبـو الفضـل، ط١/ ١٩٩٦م.

لـە خـوای بەخشـەریش داواكـارم یارمـەتیی یەكـە یەكـەمان بدات، كە بەردەوام سەرگەرمی كار لەسەر خۆكردنمان بین، بـۆ پتر تێگەیشتن و باشتر پێگەیشتن، چـونكە بێگومـان كەسـانێك كـە سەرمەشـق و پێشـڕەوی خـەڵكن، ئەگـەر تێگەیشـتوو و پێگەیشتوو نەبن و، بە كرچ و كاڵیی پێش خـەڵك بكـەون، نـەك هەر شوێنكەوتووانیان لێیـان بەهرەمەنـد نـابن، بگـرە لێشـیان زەرەرمەند دەبن و، تەنانەت نیزیكـە سەریشـیان بـە فـەتارەت دەن!

لە کۆتاییش دا دەڵێم:

بۆیە ناوونیشانەکەمان لە (سەرکردایەتییکردن و مەرجەکانی)یەوە گۆڕی بۆ: (سەرکردایەتییکردن لە ئیسلام دا چییە و چۆنە؟!) چونکە نێوەڕۆکەکەی وایە و، بۆ ئەوەی واش نەزانریٚ کە ئێمە بە گشتیی و بیٚ تێخوێندنەوەی ئینتیما و قوتابخانەی فیکریی، قسەمان لەو بابەتە کردوە، هەرچەندە کەم و زۆریش هەوڵمداوە بابەتییانە و هەرچی لەو بوارەدا پەسند و باشە، هی هەر کەسێك بیٚ، سوودی لێوەربگیریٚ.

سبحانك اللهم و بحمدك، أشهد أن لا إله الاّ أنت

أستغفرك و اتوب إليك

١٤٤٢/٥/٢٦ ك

٢٠٢١/١/١٠ ز

سەرەتا بەر لەوەی کە ڕاو بۆچوونی پسپۆڕانی ئەو بوارە بێنم، دەمەوێت ئەوە ڕابگەیەنم، کە ئێمە لە بەکارهێنانی وشەی سەرکردە (قائد)دا، مەبەستمان پێی تەنیا تاکە کەسێك نیە، لە لووتکەی دەستەڵات دا، بەڵکو مەبەستمان هەموو ئەوانەیە کە جۆرێك لە بەرپرسیارییەتییان دەکەوێتە سەر شان، بەرامبەر بە خەڵك و کۆمەڵگاکەی خۆیان، یان بەرامبەر بە کارێکی دیارییکراو، واتە وشەی سەرکردایەتییکردن بە چەمکێکی گشتیی بەکاردێنم، نەك بە چەمکێکی حیزبیی و تایبەت،و مەبەستیشم لە سەرکردە هەموو ئەو کەسانەن لە برایان و خوشکان کە ئەرکیان دەکەوێتە سەرشان، کە مشوور بخۆن لەو کارەی لەبەردەستییانە و، لەو خەڵکەی کە لە دەوریانە و سەرپەرشتییان بکەن و، ڕێنماییان بکەن و لە وزە و تواناکانیان بەهرەمەند بن، بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجانەی کە بەیەکەوە دایانناون و، لە پێش چاوی خۆیان ڕەسمیان کردوون و دیارییان کردوون.

سەبارەت بە پێناسەکردنی سەرکردایەتییکردن (القيادة)، ئەم مەبەستە، پێنج پێناسەم هێناون:

١- **القيادة:** هي عملية تحريك الناس نحو الهدف[1].

واتە: سەرکردایەتییکردن بریتیە لە پرۆسەی جووڵاندنی خەڵك بەرەو ئامانجێك.

٢- **القيادة:** القدرة على حث الآخرين على القيام بأنشطة يرتبها القائد[2].

واتە: سەرکردایەتییکردن بریتیە لە توانا لەسەر هاندانی خەڵك، بۆ هەڵسانیان بە چەند چالاکییەك کە سەرکردە ڕیزبەندیان دەکا و دایاندەنێت.

٣- **القيادة:** إنها سيطرة معينة يمتلكها الفرد على أساس أن يؤثر في سلوك الآخرين[3].

واتە: سەرکردایەتییکردن بریتیە لە دەسەڵاتێکی دیارییکراو، کە تاك وەدەستی دەهێنێت لەسەر بناغەی ئەوەی کە کاریگەریی دەبێت بۆسەر ڕەفتاری ئەوانی دیکە.

---

١) المنهج المتكامل لإعداد القادة، الجزء الأول: مفاهيم و أساسيات القيادة، د. طارق محمد السويدان ، ط ١/ ٢٠١٨م. ص ٣٢٩.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٩.

٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢٩.

٤- **القيادة:** فن التواصل و التأثير في المجتمع و تحريك الناس نحو هدف مشترك، تتحقق به منفعة الجميع بصورة إيجابية[١].

واتە: سەرکردایەتییکردن بریتییە لە هونەری مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا و، کارتێکردن لە کۆمەڵگا و جووڵاندنی خەڵك بەرەو ئامانجێکی هاوبەش کە سوودێکی ئەرێنیی تێدا دێتەدی بۆ هەموو لایەك.

٥- **القيادة:** عملية تجهيز و ترتيب الموقف القيادي حتى يتمكن مختلف أعضاء الجماعة بما فيهم القائد من تحقيق أهداف مشتركة، بأقصى عائد إقتصادي و أقل تكلفة إقتصادية في الوقت و العمل[٢].

واتە: سەرکردایەتییکردن بریتییە لە پرۆسەیەك، پرۆسەی ئامادەکردن و ڕیزبەندیی کردنی هەڵوێستێکی سەرکردانە تاکو تێکڕای ئەندامانی ئەم کۆمەڵە لە نێویشیاندا سەرکردە، بتوانن ئامانجە هاوبەشەکان بهێننەدی بە زۆرترین دەستکەوتی ئابووریی و کەمترین تێچووی ئابووریی لە ڕووی کات و لە ڕووی کارەوە.

دیارە ئەم پێناسەیە زیاتر کۆمپانیاکان دەگرێتەوە.

---

١) إعداد القادة، رؤية دعوية معاصرة، عادل عبدالله هندي، ط١/ ١٤٣٩هـ - ٢٠١٨م، ص ٢٨.

٢) القيادة الإدارية في الإسلام، عبدالشافي محمد أبو الفضل، ط١/١٩٩٦، ص٢٩.

سەبارەت بە پێناسەی سەرکردە(القائد)، بۆ ئەویش چوار پێناسەمان هێناون:

١- **القائد:** هو ذلك الشخص الذي يحوز أعظم قدر ممكن من السمات و الخصائص و الصفات الشخصية المرغوبة[١].

واتە: فەرماندە یان سەرکردە، بریتییە لەو کەسەی کە زۆرترین خەسڵەت و تایبەتمەندیی و سیفەتە کەسییە چاکەکان دەگرێتە خۆی.

٢- **القائد:** هو الشخص الذي منحه الله إمكانات ومواهب يقوم بتنميتها، بغية التأثير في الآخرين وإحداث صلاح لهم في الدنيا والآخرة..[٢]

واتە: سەرکردە کەسێکە، خوا هەندێك توانا و بەخششی پێداون، کە هەڵدەستێ بە گەشەپێدانیان بە مەبەستی کاریگەریی خستنە سەر ئەوانی دیکە و چاکسازیی تێدا پەیداکردن لە ڕووی دنیایی و دوارۆژییەوە.

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨.

٢) إعداد القادة، رؤية دعوية معاصرة، ل ٢٨.

٣- **القائد:** هو الشخص الذي ينجز الأعمال من خلال الآخرين[١].

واته: سەرکردە کەسێکە کارەکان ئەنجام دەدات بەڵام لە میانی ئەوانی دیکەدا، واتە خەڵکێك بە قسەی دەکەن کە لەبەر دەستی ئەودان و کارەکانیان پێ ئەنجام دەدات.

٤- **القائد:** هو الشخص الذي يستخدم نفوذه وقوته ويؤثّر على سلوك و توجهات الأفراد من حوله لإنجاز أهدافٍ محدَّدة[٢].

واته: سەرکردە ئەو کەسەیە کە کارتێکردن و وزەی خۆی بەکاردەهێنێت، تاکو کاریگەریی بخاتە سەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتی تاکەکانی کە بە دەوریەوەن، بەمەبەستی ئەنجامدانی چەند ئامانجێکی دیاریکراو.

ئەمانە پێناسەی سەرکردایەتییکردن و سەرکردە بوون، هەڵبەتە دەیان پێناسەی دیکەش هەن، بەڵام ئەم چەند پێناسەیەم لەنێو هەموو پێناسەکاندا پێ پەسند بوون و، دواتریش بۆچوونی خۆم لەو بارەوە دەخەمەڕوو.

---

١) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨.

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨.

شتێکی دیکەش پێویستە پێناسەی بکەین، مادام باسی سەرکردایەتییکردن دەکەین، ئەویش بریتیە لە (إدارة)، (إدارة) لەگەل (قیادة) هەندێکیان بە دوو وشەی هاوواتا یاخود واتا لێکنزیکیان دادەنێن، هەندێکیشیان بەجیا دایدەنێن، کە بێگومان ئەو بۆچوونە ڕاستترە کە (إدارة) لەگەڵ (قیادة) جیایە.

لە کوردییدا بە (إدارة) دەڵێین بەڕێوەبردن و، بە (قیادة)ش دەڵێین سەرکردایەتییکردن، یان فەرماندەیەتییکردن.

**الإدارة:** هي تنسيق جهود الأفراد و الجماعات لتحقيق هدف معين و تشمل مرحلة: التخطيط و التنظيم و التوظيف و التوجيه و التنسيق و الإبلاغ و التمويل و الرقابة[1].

واتە: بەڕێوەبردن بریتیە لە ڕێکخستنی وزە و توانای تاکەکان و کۆمەڵەکان، بە مەبەستی هێنانەدی ئامانجێکی دیاریکراو کە هەموو ئەو قۆناغانە دەگرێتەخۆی: نەخشەکێشان، ڕێکخستن، بەکارهێنان، ئاراستەکردن، پاشان دابەشکردنی کارەکان، پێ ڕاگەیاندن، هەروەها دابینکردنی تێچوو و چاودێرییکردن.

---

١) المنهج المتكامل لإعداد القادة، الجزء الأول، ل ٢٧٨.

ڕەنگە یەکێك بپرسێ: جیاوازیی نێوان (قائد) و (مدیر) واتە سەرکردە و بەڕێوەبەر چییە؟ زانایان لەو بارەشەوە زۆر قسەیان کردوە، هەڵبەتە هەندێکیان گوتوویانە ئەو دووانە تێکهەڵکێشن، لە ڕابردوودا ئەو دوو زاراوەیە لەیەکدی جیانەکرانەوە، بۆ نموونە کەسێك کەسی یەکەمی کۆمەڵگای مسوڵمان بووە، کەسی یەکەمی دەوڵەتی ئیسلامیی بووە، ئەگەر خەلیفەی پێغەمبەری خوای (علیه الصلاة والسلام) پێ گوتراوە، وەك ئەبوو بەکر (خوای لێ ڕازی بێ) ، ئەگەر (أمير المؤمنين)ی پێ گوتراوە، وەك ئەوانی دیکە، ئەگەر سوڵتانی پێ گوتراوە، وەك سەردەمی عوسمانییەکان، ئەگەر مەلیکی پێ گوتراوە... یەك کەس سەرپەرشتیی دەوڵەتی کردوە، ئەویش بێگومان کۆمەڵێك هاوکاری بوون و، کەسانێکی بەدەورەوە بوون، بە تایبەتی وەزیری (تنفيذ) و وەزیری (تفويض)، بەلاَم دەتوانین بڵێین: سەرکردە لەگەڵ بەڕێوەبەردا، ئەم جیاوازییانەی خوارەوەیان هەن[1]:

١-(سەرکردە) داهێنان و تازەگەریی دەکات و، هەر کارێك کە دەیکات بە شێوەیەکی تایبەتمەندانە دەیکات، بەلاَم لە بەرامبەریدا (بەڕێوەبەر) ئەو کارەی کە پێی سپێردراوە جێ بەجێی دەکات.

---

١) سحر القيادة، د. إبراهيم الفقي،ط١/ ٢٠١٨م، ص ١٩.

٢-(سەركردە) گەشە بە كارەكە دەدات و، هەمیشە بەدوای ئەوە دادەچێ و سۆراغی ئەوە دەكات، زیاتر كارەكەی خۆی گەشە پێ بدات، بەلاَم (بەڕێوەبەر) بەردەوامە لەسەر جێ بەجێكردنی ئەو ئەركەی پێی سپێردراوە.

٣-(سەركردە) بۆ بەڕێوەبردنی كارەكەی خۆی، پشت بە خۆی و توانا زاتییەكانی دەبەستێ، بەلاَم (بەڕێوەبەر) پشت بەو ئەركەی كە پێی سپێردراوە بە پۆستەكەی و بە پێگەكەی دەبەستێت.

٤-(سەركردە) كارە باشەكان و كارە ڕاستەكان ئەنجام دەدات، بەلاَم (بەڕێوەبەر) ئەو كارەی كە دەكەوێتە سەری، بە شێوەیەكی ڕاست و دروست ئەنجامی دەدات.

یەكێكی دی لە زانایان ئاوا بەراوردی نێوان سەركردە و بەڕێوەبەر دەكات[١]:

سەركردە جەخت لەسەر سێ شتان دەكاتەوە:

یەكەم: دیاریی كردنی ئەو ڕێڕەوە كە بۆی دەچێ، جوان ببینێ و ئامانجەكە دیار بێت.

دووەم: كۆكردنەوەی هێز و وزەكان لە ژێر ڕۆشنایی ئەو دید و بۆچوونە و بەرەو ئەو ئامانجە.

---

١) مهارات القیادة و صفات القائد، احمد بن عبدالمحسن العساف.

سێیەم: هاندانی یان وزەوەبەرنانی ئەوانەی کە دەیەوێ ئەو ئامانجانەیان پێ بێنێتەدی.

بەلاّم بەڕێوەبەر ئەوەی چاوی لەسەر چڕ دادەگرێ و گرنگیی پێدەدات، چوار شتن:

١- نەخشەکێشان
٢- ڕێکخستن
٣- سەرپەرشتییکردن یان ئاڕاستەکردن
٤- چاودێرییکردن

دەتوانین بڵێین: سەرکردە ئەو کەسەیە کە بەگشتیی سەرپەرشتیی کارەکە دەکات و، ئاگای لێیەتی و نەخشەی بۆ دادەنێ و ئامانجەکە دیاریی دەکات و، هێز و وزە و تواناکانی بۆ کۆدەکاتەوە، بەلاّم بەڕێوەبەر کەسێکە، ئەوەی سەرکردە بۆی داناوە و بۆی دیاریی کردون و چوارچێوەی بۆ داناوە، هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی ئەو کارە، واتە سەرکردە زیاتر حاڵەتی سەرپەرشتییکردن و بەسەر ڕاگەیشتنی هەیە، بەلاّم بەڕێوەبەر حاڵەتی جێ بەجێکردن و ئەنجامدانی هەیە.

بۆچـی گرنگـە سـەرکردایەتیی هـەبێ و، بۆچـی گرنگـە سەرکردە هەبێ؟ لە ڕاستییدا هەبوونی سەرکردە و مشوورخۆر لە ژیانی هەر کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکدا، زۆر پێویست و گرنگە، ئەگەر بویسترێ ئەو کۆمەڵە، یان ئەو کۆمەڵگایە، یان ئەو قەوارەیە بەڕێوەبچێ بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و، ئامانجەکانی بێنێتەدی و لە نسکۆ و تێشکان و بەرەودواوە گەڕانەوە پارێزراو بێت.

گـەورەترین هۆکـاری دواکەوتوویـەتیی ئۆممـەتی ئیسـلام بریتیـە لـە نـەبوونی سـەرکردایەتیی و سـەرکردەی دڵسـۆز و دامـەزراو و بەرچـاوڕوون و لێهـاتوو، ئەگـەر تەماشـای جیهـانی ئیسلامیی بکەین دابەش بووە بۆ چەند دەوڵـەتێك، کـە هـەموو ئەوانـەی سەرپەرشـتیی ئـەو دەوڵەتانـە دەکـەن، مەگـەر بـە دەگمەن، ئەگەرنا کەمتر وایە کەسانی لێبڕاو و دڵسۆز و خاوەن ئەو خەسـڵەت و ئاکارانـەبن، کـە بـۆ کەسـانی سەرپەرشـتیار و سەرکردە و بەڕێوەبەر پێویستن.

بێگومـان هـەبوونی سـەرکردە و سەرپەرشـتیار و هـەبوونی سـەرکردایەتییکردنی ڕاسـت و دروسـت بـۆ هـەموو کارێـك، چ گـەورە بـێ یـان بچـووك بـێ، پێویسـتە، تەماشـا دەکـەین کەشـتییەك ئەگـەر کەسـێکی نـەبێ لێیبخـوڕێ بـەرەو ئـەو

ئامانجەی بۆی دەچێ و ئاگای لێی بێت، بە دڵنیاییەوە ناگاتە شوێنی مەبەست، هەروەها ئۆتۆمبیلێك، چ جای وڵاتێك و چ جای کۆمەڵگایەك، هەر بۆیەش خوای پەروەردگار پەیتا پەیتا پێغەمبەرانی خۆی (علیهم الصلاة والسلام) ناردوون تاکو چاوساغ و ڕێنماییکاری خەڵك بن.

ئەمەش چەند نموونەیەکی ئایەتەکانی قورئان و دەقەکانی سوننەن، لەو بارەوە:

١) خوای بەرزی مەزن لە سووڕەتی (الأنبیاء)دا فەرموویەتی:

﴿ وَنَجَّيْنَـٰهُ وَلُوطًا إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَـٰرَكْنَا فِيهَا لِلْعَـٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَـٰقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَـٰلِحِينَ ﴿٧٢﴾ وَجَعَلْنَـٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَـٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾.

خوای پەروەردگار باسی ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) دەکاو دەفەرموێ: ئیبراهیممان دەرباز کرد لەگەڵ لووتدا {کە برازای بووە} بۆ ئەو سەر زەمینەی بۆ جیهانییان پیزمان تێخستوە {کە مەبەست شامە}و، ئیسحاق و یەعقووبمان بە دوای یەکدا پێدان و، هەر کامێکیشیانمان لە ساڵحان و چاکان گێڕان و کردمانن بە پێشەوایانێك کە بە فەرمانی ئێمە خەڵکیان ڕێنمایی

دەکرد و، کردەوە چاکەکانمان بۆ سروشکردن، هەروەها بەرپاکردنی و نوێژ و زەکاتدان و، لە پەرستنەران بوون بۆ ئێمە.

٢) هەروەها لە سوورەتی (السجدة) ئایەتی (٢٤)دا، خوای پەروەردگار جارێکی دیکە، ئەو ڕاستییە دووبارە دەکاتەوە بۆ پێغەمبەرانێك کە لە دوای مووساوە هاتوون، دەفەرمویَ:

﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: لەوان {لە وەچەی ئیسرائیل} پێشەوایانێکمان تێدا دانان، کە بە فەرمانی ئێمە ڕێنمایی خەڵکیان دەکرد، بە هۆی ئەوەوە، کە خۆڕاگربوون و دڵنیاییشیان هەبوو {بە ڕاستیی} ئایەتەکانمان.

٣) لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٦٥)دا، خوای پەروەردگار دوای ئەوەی ناوی دوازدە(١٢) لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) دەهێنێت، دەفەرمویَ:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾.

واتە: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەر و ترسێنەر بوون، تاکو خەڵك لە دوای هاتنی پێغەمبەران، بەڵگەی نەبیَ لەسەر خوا و، خواش زاڵی کاربەجێیە.

٤) لە سوورەتی (البقرە) ئایەتی (١٢٤)دا، خوا دەفەرموێ:
﴿وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَـٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾.

واتە: كاتێك پەروەردگاریی ئیبڕاهیم ئیبڕاهیمی بە چەند فەرمانێك تاقیكردەوە، { دەفەرموێ: بە چەند وشەیەك، دیارە وشەكان فەرمان بوون و ئەرك بوون پێی سپێردراون}، ئەویش هەموویانی تەواو كردن و {خوا} فەرمووی: دەتگێڕم بە پێشەوا بۆ خەڵك {بە سەركردە، تاكو چاوت لێ بكەن و بە دوای تۆدا بێن، مادام تۆ لە تاقیكردنەوەكان دەرچووی و ئەركەكانت هەمووی جێ بەجێكردوون، ئیبراهیمیش وەك هەر مرۆڤێك پێی خۆشە وەچەكانی باشبن و بە دوای ئەودا بێن، بۆیە} فەرمووی: ئەدی لە وەچەكەم؟ {خوا} فەرمووی: ستەمكاران پەیمانی من نایانگرێتەوە {لە وەچەكەشت، ئەوەی چاك بێ و بەدوای تۆ بكەوێ، ئەویش بە ئەندازەی چاكیی و شایستەیی، شیاوی ئەوە دەبن سەركردایەتیی بكەن و ببنە پێشەوا بۆ خەڵك، بەڵام ئەگەر ستەمكار و خراپەكار بن، بە دڵنیاییەوە پەیمانی من نایانگرێتەوە}.

٥) لە سوورەتی (ص) ئایەتی (٢٦)دا، خوای كاربەجێ داوود (علیه الصلاة والسلام) دەدوێنێ و دەفەرموێ: ﴿يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ

عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٦﴾﴾.

**واتە: ئەی داوود! ئێمە تۆمان کردوە بە جێنشین لە زەویدا بە هەق حوکم بکە و شوێن هەوا و ئارەزوو مەکەوە....**

**هەروەها گەلێك ئایەتی دی هەن لەو بارەوە، کە لە ئیسلام دا گرنگیی و پێویستییەکی تێر و تەواو بە سەرکردایەتیی و بە پێشەوایەتیی کردنی خەڵك دراوە.**

**لێرەدا ئاماژە دەکەین بە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەریش** (علیه الصلاة والسلا ):

٦) "إذا كنتم ثلاثة في سفر، فليؤمكم أحدكم، وأحقكم بالإما أقرؤكم"[1].

**واتە: ئەگەر سێ کەس بوون لە سەفەرێك، با یەکێکتان ببێتە پێشەواتان و، شایستەتریشتان بە پێشەوایەتیی ئەو کەسەیە خوێندەوارتر و شارەزاتر بێ {لە قورئان}.**

٧) "إِذَا خَرَجَ ثَ ـَ ـٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ"[2].

**واتە: ئەگەر سێ کەستان بە سەفەر چوون، با یەکێکیان بکەنە سەرکردە.**

---

١) ابن حبان: ٢١٣٢، وقال: شعيب الأرناؤوط إسناده صحيح على شرط مسلم.
٢) أبوداود: ٢٦٠٨ و حسنه الألباني و صححه.

٨) " لا يحل لثلاثة نفر يكونون بأرض فلاة إلا أمَّروا عليهم أحدهم".[١]

واتە: ڕەوا نیە بۆ سێ کەسان کە لە دەشت و چۆڵاییەک دەبن، مەگەر یەکێکیان بکەنە فەرماندە و مشوورخۆریان.

**قسەی چەند زانایەك:**

با سەرنجی قسەی چەند زانایەکیش بدەین، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە بەپێز و فەرمایشتانەی پێغەمبەری بەڕێزدا (عليه الصلاة والسلام)، کە هەمان ئەو ڕاستییەیان دووبارە کردوەتەوە:

١- الْإِمَامَةُ مَوْضُوعَةٌ لِخِلَافَةِ النُّبُوَّةِ فِي حِرَاسَةِ الدِّينِ وَسِيَاسَةِ الدُّنْيَا، وَعَقْدُهَا واجب لِمَنْ يَقُومُ بِهَا فِي الْأُمَّةِ[٢].

واتە: ئیمامەت دانراوە وەك جێنیشینایەتی پێغەمبەرایەتی لە پاسەوانیی کردنی دین و سەرپەرشتیی کردنی دنیادا و، پێویستیشە ئەو گرێبەستە و ئەرکە بسپێررێ بە کەسێك کە شایستەیەتی لە نێو ئۆممەتدا، واتە لەسەر ئۆممەت پێویستە سەرکردە و سەرپەرشتیار لە نێوخۆیاندا دابنێن.

١) أحمد: ٦٦٤٧ وقال شعيب الأرناؤوط صحيح لغيره.
٢) الماوردي، الأحكام السلطانية، ص٤٩، تحقيق د. جاسم الحديثي.

٢- المُلك والدين توأمان، فالدين أصل، والسلطان حارس، وما لا أصل له فمهدوم، وما لا حارس له فضائع، ولا يتم الملك و الضبط إلا بسلطان(١).

واتە: حوكمڕانیی و دینداریی دووانەن و پێكەوەن، دین بناغەیەو، حوكمڕانییش بریتیە لە پاسەوان، هەر شتێك بناغەی نەبێت ڕووخاوەو، هەر شتێكیش پاسەوانی نەبێت فەوتاوەو، حوكمڕانیی و كۆنتڕۆڵكردنیشی بەبێ سەركردە و بەبێ كەسێك كە خاوەن دەسەلآت بێ، نایەتەدی.

٣- وأجمع المسلمون على أن الولايات من أفضل الطاعات فإن الولاة المقسطين أعظم أجراً وأجل قدراً من غيرهم لكثرة ما يجري على أيديهم من إقامة الحق ودرء الباطل، فإن أحدهم يقول الكلمة الواحدة، فيدفع بها مائة ألف مظلمة فما دونها، أو يجلب بها مائة ألف مصلحة فما دونها(٢).

واتە: مسوڵمانان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە سەرپەرشتیی كردنی كاروباری خەڵك، گەورەترینی فەرمانبەرییەكان و خواپەرستییەكانە، چونكە سەرپەرشتیارە دادگەرەكان پاداشتیان زۆر گەورەترە و قەدر و ڕێزیشیان زیاترە لەوانی

---

١) الغزالي، إحياء علوم الدين، ج١، ص١٧/ ط دار المعرفة – بيروت.

٢) العز بن عبدالسلام، قواعد الحكام في مصالح الأنام، ج١، ص١٤٢/ ١٤١٤هـ – ١٩٩١م، مكتبة الكليات الأزهرية – القاهرة .

دیکە، بەهۆی ئەوەوە کە لەسەر دەستی ئەوان هەق دەچەسپێ و ناهەق لا دەچێت، چونکە یەکێکیان قسەیەك دەکات، بەهۆی ئەو قسەیەوە سەد هەزار ستەم لادەچێ، یان کەمتر یان زیاتر و، سەد هەزار بەرژەوەندیی زیاتر یان کەمتر دێتەدی.

دیارە ئەوە بەپێی سەلیقەی خۆی و لە ڕۆژگاری خۆیدا، ئەگەرنا ئێستا لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، کە ژمارەی خەڵك و ژمارەی دانیشتووان زیاتر بووە، جاری واهەیە کە دەسەڵاتدارێك قسەیەك دەکات، کاریگەریی هەیە لەسەر ملیۆنان خەڵك، بەڵکو چەند ملیار کەسێك، چ بە باری هەق و، چ بە باری ناهەقدا.

٤- يَجِبُ أَنْ يُعْرَفَ أَنَّ وِلاَيَةَ أَمْرِ النَّاسِ مِنْ أَعْظَمِ وَاجِبَاتِ الدِّينِ، بَلْ لاَ قِيَامَ لِلدِّينِ وَلاَ لِلدُّنْيَا إلاَّ بِهَا. فَإِنَّ بَنِي آدَمَ لا تَتِمُّ مَصْلَحَتُهُمْ إلاَّ بِالإِجْتِمَاعِ لِحَاجَةِ بَعْضِهِمْ إِلَى بَعْضٍ وَلا بُدَّ لَهُمْ عِنْدَ الإِجْتِمَاعِ مِنْ رَأْسٍ[1].

واتە: پێویستە بزانرێت کە سەرپەرشتییکردنی خەڵك و، سەرکردایەتییکردنی خەڵك، لە مەزنترینی ئەرکەکانی دینداریییە، بەڵکو نەدین و نە دنیا {نە دینداریی و نە دنیاداریی} بەڕێوە ناچن بەبێ سەرپەرشتیی و سەرکردایەتییکردن و، مرۆڤەکان بەرژەوەندییان نایەتەدی

---

١) ابن تيمية، السياسة الشرعية، ج١، ص١٢٩/ط، ، ١٤١٨هـ.

مەگـەر کۆببنــەوە ســەریەك، چـونکە هەنـدێکیان پێویســتیان بەهەندێکی دیکەیان هەیەو، کـاتێکیش کـە کۆدەبنـەوە، دەبـێ سەرێکیان هەبێت.

لە کۆتایی ئەم تەوەری دووەمەدا، ئەوە دەڵـێم، کـە ئەگـەر سـەرنجی دروسـتکراوەکانی خـوای پـەروەردگار بـدەین، هـیچ دروستکراوێك نابینین سەری نـەبێت، هـەموو دروسـتکراوەکانی خـوا سـەریان هەیـەو، ئەگـەر کۆمـەڵ بـن لـە نێـو خۆیانـدا سەرپەرشـتییار و مشـوورخۆرو بەڕێوەبـەریان هەیـە، هـەموو دروستکراوەکانی خوا هەروان، بەڵام بۆ وێنە:

١- لـە مێـرووودا ئـەوە زۆر دیـارە کـە خـوای پـەروەردگار سووڕەتێکی قورئانی بەناوی مێرووولەوە ناونـاوە(سـورة النمـل) کە لەوێدا لەبارەی سولەیمان و سوپاکەیەوە دەفەرموێ:

﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوۡاْ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمۡلِ قَالَتۡ نَمۡلَةٞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٨﴾﴾. النمل.

واتە: تاکو کاتێـك {سـولەیمان و سـوپایەکەی} چـوونە لای شـیوی مێـرووان {دۆڵێـك، شـیوێك بـووە، شـارێکی گـەورەی مێرووی لێبووە) مێرووولەیەك گوتی: ئەی مێرووەکـان! بچـنەوە نێو شارەکانی خۆتان، شوێنەکانی خۆتان، نەبادا سـولەیمان و سوپایەکەی بتانشکێنن، بێ ئەوەی پێ بزانن.

کەواتە: دیارە ئـەو مێـرووە، یـان سـەرکردەیان بـووە، یـان چاودێریان بووە و ئاگاداری کردوونەتەوە.

٢- هەروەها خوای پەروەردگار سوورەتێکی دیکەی لە قورئان بە (النحل) ناوناوە، کە لەوێدا باسی هەنگ دەکا و دەفەرمویٚ:

﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾.

ئنجا هەر کەسێك سەیری مێروو بکات، ڕێك و پێکیی زۆر لە ژیانیاندا هەیە: زەخیرە هەڵدەگرن و پاشەکەوتی دەکەن، ئەو زەخیرەیە بۆ ئەوەی نەڕوێتەوە ئەگەر یەك نێوك بیٚ، دەیقرتێنن و دەیکەنە نیوەو، ئەگەر دووان بیٚ دەیکەنە چوار بەش، هەروەها ئێشکگریان هەیەو، کاروباری خۆیان جوان ڕێك دەخەن، هەندێك لە زانایان کتێبیان لەسەر مێروولە و ژیانی مێروولە داناوە، هەورەها هەنگیش بەهەمان شێوە یەکێکە لەو زیندەوەرانەی کە ژیانی ڕێك و پێکییەکی تێدایە، کە بۆ ئێمە زۆر زاندراوە، بەڵام تەنها مێروولە و هەنگ نین، ڕێك و پێکیی لە ژیانیاندا هەیەو، سەرکردەیان هەیە و سەرپەرشتیاریان هەیە، بەڵکو هەموو دروستکراوەکانی خوا هەروان، ئەو پۆلە باڵندانەی کە بە ئاسماندا گەرمیان و کوێستان دەکەن، تەماشا دەکەین، یەکیان پێش دەکەویٚ، هەروەها لە دارستاندا ئاژەڵەکان کە دەبینین بە ڕەوە دەڕۆن، یەکێکیان پێش دەکەویٚ و یەکێکی دیکەیان ئێشکچییە، ئەوە تەنها شێر و پڵنگەکان نین، وابن، بەڵکو هەموو ئاژەڵەکان هەروان،

زیندەوەرەكان هەروان، پەلەوەرەكان هەروان.

پێغەمبەری كۆتایی (محمد) (علیه الصلاة والسلام) وەك سەرنج ڕاكێشانی ئێمە بۆ ئەوە كە وەك چۆن خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: هیچ كام لە دروستكراوەكان نین، مەگەر ئەوانیش وەك ئێوە ئۆممەتن،[1] دەفەرمویٚ: (إِنَّ مَثَلَ الْمُؤْمِنِ لَكَمَثَلِ النَّحْلَةِ، أَكَلَتْ طَيِّبًا وَوَضَعَتْ طَيِّبًا، وَوَقَعَتْ فَلَمْ تَكْسِرِ ولم تَفْسُدْ)[2].

واتە: بڕوادار وەك مێش هەنگوینە وایە خواردنی پاك و چاكی خواردوەو، بەرهەمی پاك و چاكیشی بووەو، كاتێك كە كەوتوە، نەشكاوە و تێكیش نەچووە، پێغەمبەری كۆتایی (محمد)(علیه الصلاة والسلام) مرۆڤی بڕوادار دەچوویٚنیٚ بە هەنگەوە.

لە كۆتایی ئەم تەوەرەدا ئەم شیعرە دەڵێین، كە یەكێك لە شاعیرەكان گوتوویەتی و قسەیەكی جوانە، دەڵێت:

لاَ يَصْلُحُ النَّاسُ فَوْضَى لاَ سَرَاةَ لَهُمْ
ولا سَرَاةَ إِذَا جُهَّالُهُمْ سَادُوا[3]

---

١) ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمْثَالُكُم﴾ الأنعام: ٣٨.

٢) احمد: ١٨٧٢، و قال عنه الشيخ شاكر إسناده صحيح.

٣) الأفوه الأزدي، صلاءة بن عمرو بن مالك، من بني أود من مذحج. شاعر يماني جاهلي يُكنَّى أبا ربيعة، قالوا: لقب بالأفوه لأنه كان غليظ الشفتين، ظاهر الأسنان.

واتــە: خــەڵك چــاك نــابن، ئەگــەر پاشــاگەردانیی بــێ و ســـەركردەیان نـــەبن و مشـــوورخۆریان نـــەبن، ســـەركردە و مشوورخۆریشیان نابن، ئەگەر نەفامەكانیان بالآدەست بن.

چونكە ئەگەر نەفامەكان بالاّ دەست بوون، ئەوانەی خـاوەن عەقڵ و هۆشن، ئەوانەی خاوەن تەگبیرن و دڵسۆزن، دەكەونـە پەراوێزەوە، وەك ئێستا لە زۆربـەی كۆمـەڵگاكانی مسـوڵماناندا وای دەبیـنین و، وەك لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا (علیه الصلاة والسلام) **هاتوە**: (رُویبضة) بۆتە حوكمڕان:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " سَيَأْتِي عَلَى النَّاسِ سَنَوَاتٌ خَدَّاعَاتُ، يُصَدَّقُ فِيهَا الْكَاذِبُ، وَيُكَذَّبُ فِيهَا الصَّادِقُ، وَيُؤْتَمَنُ فِيهَا الْخَائِنُ، وَيُخَوَّنُ فِيهَا الْأَمِينُ، وَيَنْطِقُ فِيهَا الرُّوَيْبِضَةُ ". قِيلَ: وَمَا الرُّوَيْبِضَةُ ؟ قَالَ: "الرَّجُلُ التَّافِهُ فِي أَمْرِ الْعَامَّةِ ".) (١)

واتــە: ســالآنێكی فریـودەر دەبـن: بابـای ئەمینـداریان تێـدا بـەخائین دادەنرێ و، بابـای خـائین بـە ئەمینـدار، ڕاسـتگۆ بـە درۆزن دادەنــرێ و، درۆزن بـــە ڕاســـتگۆ، ڕوەیبیـــزە تێیـــان حوكمڕان دەبێ.

گوترا: ڕوەیبزە كێیە؟

فەرمووی: پیـاوی بوودەڵـەو هـیچ قسـە لـەبارەی كاروبـاری كۆمەڵگاوە دەكات.

---

٢) أخرجه إبن ماجه برقم: ٤٠٣٦، قَالَ الألباني: صحيح.

هەندێك لەو بیردۆزانەی ئەو زانایانەی كە پسپۆڕن لەم ڕۆژگارەدا، دەیانهێنین، دیارە زۆر بیردۆزەیان خستوونەتەڕوو، بەلاَم چواریانم پێ لە هەموویان گرنگتر بوون، ئەو چوارەمان هێناون:

## ١- تیۆری پیاوی مەزن: {نظریة الرجل العظیم} (الكاریزما) Great Man Theory

دواتر چەند بیردۆزەیەك لەمە جیابوونەوە وەك لق، ئەوانیش بریتین لە:

أ- بیردۆزەی فەرماندە: (نظریة الأمیر) The Prince Theoty

- بیردۆزەی پالّەوان: (نظریة البطل) The Hero Theoty

ج- بیردۆزەی كاریزما: (نظریة المتمیز) The Suprman Theoty

ئەم بیردۆزەیەش بە هەرسێك جۆرەكەیەوە دەلّێت: ئەوانەی دەبن بە فەرماندە و سەرۆك، كەسانێكی تایبەتن و دیارییكراون و، ئەو توانایەیان هەیە و هەموو كەس ئەو توانایەی نیە.

ئنجا بێگومان ئەم بیردۆزە بە پێودانگی ئیسلامەتیی ڕاست نیە، چونكە ئەمە سەرەنجام سەردەكێشی بۆ دیكتاتۆریی و

ڕاوێژ نەکردن بە خەڵك و حیساب نەکردن بۆ خەڵك و، دواتریش کردنە میراتی حوکمڕانیی، واتە: حوکمڕانیی دەکرێتە میرات، چونکە حوکمڕان پیاوێکی مەزنە و، پاشان کوڕەکەشی هەر لە خۆوە بە مەزن و نەوەکەیشی هەر بە مەزن دادەنرێن، هەروەك لە واقیعی ئێستای زۆرێك لە وڵاتانی مسوڵمانانشین دا دەبینین.

## ٢- بیردۆزەی ئاکارەکان (نظرية السمات) Traits Theory

ئەمەش وەك کاردانەوەی بیردۆزەی پێشوو سەری هەڵدا، چونکە بیردۆزەی پێشوو سەردەکێشێ بۆ حوکمی تاکەکەسیی و، تاکڕەویی و، خۆسەپاندن و، سەرەنجام حوکمی میراتیی، بۆیەش ئەم بیردۆزە دەڵێت: نەخێر بەڵکو هەر کەسێك کە دەبێتە سەرکردە، دەبێ کۆمەڵێك سیفەتی تێدا هەبن و، سیفاتەکانی وای لێ دەکەن ببێتە سەرکردە، نەك لەبەرئەوەی هەر لە خۆیدا سەرکردەیە، یان لە بابی بۆی بە جێماوە، بەڵکو دەبێ کۆمەڵێك سیفەت و تایبەتمەندیی تێدا هەبن.

بێگومان ئەم بیردۆزەیەش خاڵی بێهێزی خۆی هەن، کە یەکێك لەو خاڵە بێهێزانە ئەوەیە، ئەو خەسڵەت و سیفەتانە دیاریی نەکراون، وەك دواتر قسەی لە بارەوە دەکەم و، مشتومڕی زۆر هەبووە لە نێوان پسپۆڕاندا، کە ئایا سەرکردە دەبێ خاوەنی چ سیفەتێك و چ خەسڵەتێك بێت؟ پاشان

سیفەتی وا نیە هەموویان تێیدا هاوبەش بن، واتە: كە باسی هەندێك لە سەركردەكان كراوە، بۆ وێنە: باسی ناپلیۆن دەكرێ، باسی یەكێكی دیكە دەكرێ، ئنجا ئەگەر یەكیان ئەو سیفەتەی هەبووە و بەهۆی ئەوەوە شایستەی ئەوەبووە كە سەركردە بێت، یەكێكی دیكە سیفەتێكی دیكە و ئەوی دی سیفەتێكی دیكەی هەبووە، بۆیە ئەمەش تەواو هەق ناپێكێ، بەلاّم هەر چۆنێك بێت لەوەی یەكەم باشترە.

## ٣- بیردۆزەی هەلّوێستیی (النظرية الموقفية) Situation Theory

ئەم بیردۆزەیە دەلّێت: سەركردە لە هەلّوێستدا لە دایك دەبێت، واتە: هەلّوێستە كە توانای كەسەكانمان بۆ دەردەخات، كێ چی لە تواناد هەیە؟ وەك پەندە عەرەبییەكە دەلّێ : (الشدائد صَيقلُ الرجال)، واتە: سەختییەكان تیف تیفەدەری پیاوانن، لە ئەنجامی سەختیی و ناڕەحەتییەكاندا، سەركردەكان پەیدا دەبن، ئەمەش تاڕاددەیەكی زۆر وایە و خالّی هەقە لەم بیردۆزەیەدا، ئەگەر تەماشای قورئانیش بكەین، خوای كارزان، كە باسی داوود دەكات، داوود (عليه الصلاة والسلام) هیچ باس و خواسی نیە لە بەسەرهاتی تالّووتدا، بەلاّم لە گەرمەی شەڕدا داوود پەیدا دەبێت، كە شوان بووە، بە قۆچەقانی جالووتی كوشتوە، كە فەرماندەی سوپای

بەرامبەر بووەو، ئەهلی کوفر بوون، واتـە لـە هەڵوێسـتدا داوود (علیه الصلاة والسلام) پەیدا دەبێـت، ئنجـا ئـەم بیردۆزەیـە خـاڵی بەهێزی هەیە، بەلاَم بێگومان خـاڵی بێهێزیشـی هەیـە، ئـەویش ئەوەیە، کە ناکرێ هەمیشـە خـەڵك چاوەڕێی ئـەوە بیّ، کـەی قەیرانێك دێتە پێش؟ تاکو سەرکردەیەك تێیدا لـە دایـك بێـت! پاشان ئەو بیردۆزەیـە وا سـەیری سـەرکردە دەکـات، کـە هـەر ئەرکێکی دێتە پێش ئەنجامی دەدات! خـاڵێکی دیکـەی لاوازی ئەم بیردۆزەیـە ئەوەیـە، کـە ڕەنگـە کەسـێك لـە هەڵوێسـتێکدا سەرکەوتووبووبێت، بەلاَم ئەوە بۆی بووبێت بە پاساوی ئەوەی کە ببێتە حوکمڕانێکی ڕەها و حوکمڕانێکی خۆسـەپێن، بـەڵکو دوای خۆی حوکمڕانیی بۆ کوڕ و نەوەکانی بگوازرێتەوە.

## ٤- بـــــیردۆزەی ڕەفتـــــاریی (النظريـــــة السـلوكية) Behavioral Theory

مەبەست لەم بیردۆزەیە ئەوەیە کـە سـەرکردە کەسـێکە بـە ڕەوشت و ڕەفتار و چاکەکاری خۆی لەگەڵ دەوروبەرەکەی دا، دەوروبەرەکـەی خـۆی پێشـی دەخـەن، چـونکە ڕازاوەیـە بـە ڕەوشت و ئاکاری جوان و لەگەڵ خەڵکەکەدا باشە.

ئەمـەش بێگومـان ڕاسـت و هەقـە لـەم بیردۆزەیـەدا، بـەلاَم هـەقێکی ڕەهـاش نیـە، چـونکە زۆر کەسـیش چـاکە و خـۆش خولْقە، بەلاَم مەرجیش نیە بە کەڵکی سەرکردایەتییکردن بێت.

## سەرکردایەتیکردنی تێرو تەواو:

با بزانین سەرکردایەتییکردنی تێر و تەواو چییە و چۆن دەبێت؟ پێم وایە سەرکردایەتییکردنی تێرو تەواو ئەوەیە، کە ئەو کەسەی دەبێتە سەرکردە، دەبێ سەرجەم خاڵە بەهێزەکانی ئەو چوار بیردۆزەیە لە خۆیدا کۆبکاتەوە، هەروەها کۆمەڵێك تایبەتمەندیی دیکەش کە ئێمە لە شەریعەتدا هەمانن، دیارە ئەمانە هیچیان خۆیان نادەنە سەر شەریعەت و وەحیی خوای پەروەردگار، لەبەر ئەوەی ئەو بیردۆزانە زیاتر لەو کۆمەڵگایانەدا پەیدابوونە کە کۆمەڵگای سیکۆلاریزم بوون لە وڵاتانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا.

کەواتە کەسی سەرکردە پێویستە:

١-توانایەکی زاتیی هەبێ، واتە توانا و کاریزمایەکی هەبێ، بەڵام خۆی دوور بگرێ لە خۆپەسندیی و دیکتاتۆریی و خۆ سەپاندن.

٢-کەسی سەرکردە دەبێ خاوەنی خەسڵەتە پێویستەکانی سەرکردایەتییکردن بێ، بەڵام لە هەرکات و شوێن و ژینگەیەدا بە پێی خۆی.

٣-دەبێ سەرکردە هەوڵبدات مەردی مەیدان و پیاو هەڵوێستان بێ، کاتێك شتێك دێتەپێش، ئامادەبێ خۆی بداتەبەر.

٤-هەتا دەشتوانیٚ ڕەوشت و ڕەفتاری بەرز و پەسند بیٚ، ەلاَم نەك لەسەر حیسابی هەق و موجامەلەكردنی خەلَك ە ناهەق.

٥- بەلاَم بیٚگومان لە پیٚش هەموو ئەوانەدا، پیٚمان وایە كەسیٚك شایستەی سەركردایەتیكردنە لە نیٚو ئەهلی ئیسلامدا، كە بەندەیەكی چاك و ساغ بیٚ بۆ خوا و، پابەند بیٚ بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوەو، ڕازاوە بیٚ بە هەموو ئەو ڕەوشت و سیفەتانەوە، كە خوای ەروەردگار بەندە چاكەكانی پیٚ وەسف كردوون.

ڕیٚزان!

ئەمە چاوپیٚداگیٚڕانیٚكی چەند بیردۆزەیەكی هەندیٚك لە زانا ڕۆژئاواییەكان بوو، لە بارەی سەركردایەتیكردنەوە، هەروەك ئاماژەم پیٚدا، هیچیان لە كەم و كوڕیی خالَیی نین و، بیٚگومان لە ئیسلامدا ئیمامەتیی كردنی خەلَك و سەركردایەتییكردنی خەلَك، ویٚڕای ئەو خالَە بەهیٚزانەی كە لە بیردۆزەكاندا هەن، كۆم لیٚك شتی دیكەش هەن كە ئیٚمە خوا پشتیوان بیٚ لە تەوەری چوارەمدا {خەسلَەتە بنەڕەتییەكانی سەركردە و ئەركە گرنكەكانی}، كە لە چل (٤٠) خالَدا هیٚناومانن، تیشك دەخەینە سەر ئەو بابەتە.

ڕێزان !

سەرەتا دەمەوێ ئەوەتان پێ بڵێم: كە وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: {كەس بە خەیاڵ نەبووە بە ماڵ}، ئەگەر هەریەك لە ئێمە بمانەوێ ئەركی بەرپرسیارییەتیی خۆی بەرامبەر خەڵك و كۆمەڵگاكەی باش جێ بەجێ بكات و، شایستەی ئەوە بێ پێی بگوترێ: پێشەوا بۆ خەڵك، سەرمەشق بۆ خەڵك، چاوساغ بۆ خەڵك، سەركردە بۆ خەڵك و، خەڵك متمانەی پێ بكەن و، بۆ دینداریی و دنیاداریی خۆیان چاوی لێ بكەن و، بیكەنە سەرمەشق و پێشەوایان، پێویستە هەموو ئەو خەسڵەتانەی بۆ سەركردەیەك بە مەرج گیراون، هەروەها هەموو ئەو ئەركە گرنگانەی كە لەسەر شانی دانراون، هەوڵبدات بەپێی توانا هەم خەسڵەتەكان لە خۆیدا بێنێتەدی و، هەم ئەركەكانیش جێ بەجێ بكات، ئەگەرنا بەزەییم بە یەكێكدا دێتەوە كە ناوێكی گەورەی لە خۆی ناوە، بەڵام نێوەڕۆكێكی خراپی هەیە، یان ناوونیشانێكی گەورەی هەیە بەڵام نێوەڕۆكێكی وێرانی هەیە، كوردەواریی خۆمان چەند پەندێك بۆ ئەو جۆرە كەسانە بەكاردێنن یەكێك لەوانە دەڵێن: {دوور كوژی نزیك خەسار}، واتە: لە دوورەوە خەڵكی خۆی بۆ دەكوژێ، بەڵام كە دێتە نزیكی دەڵێ: ماندووبوونەكەم كە هاتم

بۆ لای خەسار بوو، هەروەها دەگوترێ: {ڕواڵەت جوانی نێوەڕۆك وێران}.

شارەزایانی بواری سەركردایەتیی لە بارەی خەسڵەتەكانی سەركردە و ئەركە گرنگەكانیەوە، قسەی زۆریان كردوون، هەیانە گوتوویەتی: خەسڵەتەكان پێنجی سەرەكیین، هەیانە گوتوویەتی: حەوتن، هەیانە گوتوویەتی: دەن، هەیە گوتوویەتی: دوازدەن، هەیانە گوتوویەتی: بیستن، هەشیانە زیاتری باسكردوون، سەبارەت بە ئەركەكانیشەوە بە هەمان شێوە، بەڵام دوای لێكۆڵینەوە و وردبوونەوەی زۆر، گەیشتمە ئەو قەناعەتە كە ئەم چل (٤٠) خەسڵەتە كە هەر هەمووشیان خەسڵەت نین، بەڵكو هەندێكیان ئەركن، پێم وایە كەم و زۆر هەموویان بۆ كەسی سەركردە(قائد) پێویستن، هەر كەسە بە قەدەر خۆی و بە پێی خۆی، ئەوانیش ئەمانەی خوارەوەن:

## ١- بوونناسیی ڕێك و ڕاست:

كەسی سەركردە پێویستە بوونناسییەكی، یان تێڕوانینێكی ڕاست و دروستی هەبێ بۆ خۆی و بۆ خوای پەروەردگار و بۆ بوونەوەر و بۆ ژیان و بۆ دنیا و بۆ دوارۆژ، لێرەوە ئیمان و عەقیدە پەیدا دەبێت، لێرەوە خواپەرستیی، لێرەوە ئەخلاق و ڕەوشت، لێرەوە هەڵوێستی باش و خراپ پەیدا دەبێت، ئنجا پوختەی

بوونناسیی ڕاست و دروستی ئیسلامیی، ئەوەیە کە ئێمە ئەم گەردوونە بە شوێنی تاقی کرانەوەی مرۆڤ دەزانین کە خوای پەورەردگار وای فەرمووە و، ئەم گەردوونە خوای پەروەردگار لە نەبوونەوە هێناویەتەدی و، خۆی ڕێکی خستوە و خۆشی سەرپەرشتی دەکا و، دەستپێکێکی هەیە و کۆتاییەکیشی هەیە و، ژیانی دنیا کە مرۆڤی تێدا دانراوە، تاقیگەیەکە مرۆڤی تێدا دانراوە، هۆڵێکی تێدا تاقی کرانەوەیە بۆ مرۆڤ و، ژیانی دنیا قۆناغی دیکەی بە دوا دادێت کە قۆناغی بەرزەخە، پاشتر قۆناغی قیامەتە و، مرۆڤ زۆر لەوە گەورەترە، کە تەنیا بۆ ژیانێکی پێنج و دوو ڕۆژی دنیایی هاتبێتە ئێرە.

لە بەرگی یەکەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا، بە دووردرێژیی باسی بوونناسییم کردوە، هەروەها لە کتێبی چوارەمی مەوسووعەی (بیرکردنەوەی ئیسلامیی)دا، لەوێش تاڕاددەیەك بە درێژیی باسی پایەکانی بووناسیی ئیسلامییم کردوە، گرنگ ئەوەیە خەسڵەتی یەکەمی کەسی سەرکردە لەڕوانگەی ئیسلامەوە، ئەوەیە، کە خاوەنی بوونناسیی و تێڕوانینێکی ڕاست و دروست بێت بەرامبەر بە خوا، بەرامبەر بە گەردوون، بەرامبەر بە ژیان، بەرامبەر بە مرۆڤ و، بەرامبەر

بە هەموو ئەو شتانەی، کە ئیسلام قسەی لەبارەوە کردوون، کە بێجگە لە وەحیی خوا هیچ کەسی دی شایستەیی و مافی ئەوەی نیە وەلاَمی ئەو پرسیارە بوونیانە بداتەوە، کە بە درێژایی مێژووی بەشەر فەلسەفە بە دوای وەلاَمییانەوە بووە، کە ئەم گەردوونە چییە و لە کوێ هاتوە؟ بۆچی دروستکراوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ مرۆڤ شوێنی لە ئیعرابی گەردووندا چییە؟ سەرەتای چۆنە؟ سەرەنجامی چۆنە؟ ئەرکی چییە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ وەلاَمی ئەم پرسیارانە تەنها لە وەحیی خوای پەروەردگاردایە، ئنجا هەموو ئەو پرسیارانەو وەلاَمەکانیان، پێیان دەگوترێ: بوونناسیی(علم الوجود).

٢- ئیمانی دامەزراو:

ئیمان بە هەر چوار پێکهێنەرەکەیەوە و، بە هەر شەش پایەکەیەوە، پێکهێنەرەکانی ئیمان بریتین، لە:

أ- بەڕاستزانین و دەرککردنی عەقلێ.

- پەسندکردنی بە دلێ.

ج- دانپێداهێنانی بە زمان.

د- ئەنجامدانی ە ئەندامەکان.

مرۆڤ چوار هێزی هەن:

أ- هێزێکی ئیدراکیی کە شتی پێ دەرك دەکات و لە عەقڵدا بەرجەستەیە.

ب- هێزێکی هەیە شتی پێ قبوول دەکات، یان ڕەت دەکات، کە لە دڵ و دەروونی دا بەرجەستەیە.

ج- هێزێکی هەیە ئەوەی کە لە دەروونیدایە، پێی دەردەبڕێ، کە لە زمانی دا بەرجەستەیە.

د- هێزێکیشی هەیە شتەکانی پێ جێ بەجێ دەکات، کە لە جەستەیدا بەرجەستەیە.

ئنجا هەر کام لەو هێزانە پەیوەندییان بە ئیمانەوە هەیە و، ئیمان کاتێك پێی دەگوترێ: ئیمانی تەواو، کە هەر چوار پێکهێنەرەکەی هەبن.

هەروەها ئیمان شەش پایەی هەن کە بریتین لە:

١- ئیمان بە خوا.

٢- ئیمان بە فریشتەکانی.

٣- ئیمان بە کتێبەکانی.

٤- ئیمان بە پێغەمبەرانی.

٥- ئیمان بە ڕۆژی دوایی.

٦- ئیمان بە نەخشەی خوای پەروەردگار و ئەندازەگیرییەکەی.

کەواتـە دووەم خەسـڵەتی پێویسـت، کـە پێویسـتە لـە کەسی سەرکردەدا هـەبێ، ئەوەیـە کـە ئیمـانی دامـەزراوی هەبێ، ئیمانی تێرو تەواو و دامەزراو.

## ٣- خواپەرستییەکی تێروتەواو:

واتە خواپەرستییەکی ڕێك و ڕاست و، دوور لـە بیدعـەت و دوور لـە شـیرك و، دوور لـە ڕیـا و، دوور لـە لادان، ئنجـا خواپەرستییش بە هەموو جۆر و بەشـەکانیەوە، لـە پـێش هەمووشـیانەوە پێـنج دروشـم و پایـە سـەرەکییەکانی: نوێژکردن، زەکات دان و ماڵبەخشین، ڕۆژووگرتن، حـەج و عـومرەکردن، یـادی خـواکردن، لـە مەوسـووعەی: (خواپەرستی ئیسلامیی)یشدا بە درێژیی قسەمان لە بارەی هەر پێنجیانەوە کردوە.

## ٤- عاقڵمەندیی و هۆشیاریی:

لە ڕاستییدا کەسی سەرکردە لـە ئیسـلام دا، پێویسـتی بەوەیە کە عەقڵێکی باشی هەبێ، دەگونجا عـەقڵ بخەینـە پێشەوەش، چونکە بە عەقڵی تەواو، بوونناسیی و ئیمان و خواپەرسـتیی دێتـەدی، بـەڵام بـە ئیعتیبـارێکی دیکـە ڕیزبەندییەکەم وا داناوە، یەکـەمین شـتێك کـە مرۆڤ دەبـێ هـەیبێ، بریتیـە لـە بوونناسـیی، دوایـی بـە هـۆی

بوونناسییەکەیەوە، لە عەقڵەکەی بەهرەمەند دەبێ و، بەهۆی بوونناسییەکەیەوە، ئیمان و عەقیدەکەی پەیدا دەبێ و، خواپەرستیی پەیدا دەبێ و، عەقڵەکەشی باش بەکاردێنێ.

## ٥- پارێزکاریی:

پارێزکاریی بەرهەمی بوونناسیی و ئیمان و عەقیدە و خواپەرستیی و عەقڵی هۆشیارە، لە ئەنجامی ئەمانەدا مرۆڤ پارێزکار دەبێ و بەشێوەیەك مامەڵە دەکات کە لە خۆی وریا دەبێ، شتێك نەکات کە خوا پێی ناخۆش بێت، خوای کارزان و میهرەبان بە گشتیی دوو شتی پێ ناخۆشن، لە مرۆڤدا، یەکەم: ئەرکەکانی کە لەسەری پێویستکردوون بیانچوێنێ کەم و زۆر، دووەم: شتەکانی کە لێی قەدەغە کردوون، بیانشکێنێ، پارێزکاریی بریتیە لەوە کە مرۆڤ لە خۆی وریا بێ، خوا لە خۆی توورە نەکات و، خۆی تووشی سزا و جەزرەبەی خوا نەکات، بە چواندنی ئەرکەکان، یاخود شکاندنی قەدەغەکان.

یەکێك لە زانایان دەڵێت: (التقوى هو أن لا يجدك الله حيث منعك، وأن لا يفتقدك حيث ألزمك)، واتە: پارێزکاریی ئەوەیە کە خوا تۆ لەو شوێنە نەبینێ کە لێی قەدەغەکردووی و، لەو شوێنەش تۆ نادیار نەبی، کە تۆی

پابەندکردوە و لەسەری پێویست کردووی، واتە: هەموو ئەرکەکان جێبەجێ بکەی بە پێی توانا و، هەموو قەغەکراوەکانیش خۆتیانی لێ بەدوور بگری، بەپێی توانا.

## ٦- تەزکیەی نەفس:

لە ئەنجامی هەبوونی پارێزکاریی (تەقوا)دا، نەفسی مرۆڤ تەزکیە دەبێ، بۆیە دەبێ مرۆڤ خۆی بپارێزێ لە شکاندنی قەدەغەکان و لە چواندنی ئەرکەکان، ئنجا وردە وردە نەفسی پاك و چاك دەبێت، دیارە هەرکام لەمانە کە باسیان دەکەم کتێبم لەبارەیانەوە نووسیوە بۆ وێنە: لە هەردووك کتێبی: (رێگای سالّح بوون و بەرەو خوا چوون) و (گیانی ژیان) بە درێژیی باسی تەزکیەی نەفسم کردوە.

## ٧- ڕەوشت و ئاکاری بەرز و پەسند:

ئەمەش خەسڵەتێکی زۆر گەورە و گرنگ و پێویستیی هەر کەسێکە، کە بیەوێ لە ئیسلام دا وەك سەرکردە و بەرپرس تەماشا بکرێ، هەروەها وەك سەرکردە و بەرپرس بتوانێ بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵسێت، چ بەرامبەر بە کۆمەڵەکەی، چ بەرامبەر کۆمەڵگاکەی، چ بەرامبەر دەوڵەت و قەوارە سیاسییەکەی. لە هەردووك سەرچاوەی مەوسووعەی: (ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی) و، (ئەدەب و

ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان)دا، بە درێـژیی باسـی ڕەوشـت و ئاکار و ئەدەبە بەرزەکانم کردوە.

## ٨- زانیاریی بە ئاین و ئاشنایی بە ژین:

ئەمەش خەسڵەتێکی زۆر گرنگ و پێویسـتە بـۆ کەسـێك بیـەوێ بـە بـەرپرس دابنـرێ و، بەرپرسـیارییەتی خـۆی بەرامبـەر دیـن و ژینـی کۆمەڵگایەکـەی جـێ بـەجێ بکـات، دەبێ لە دیندا شارەزا بێ و بە ژینیش ئاشـنا بـێ، چـونک هەر بەوەندە کارەکەی بۆ پێکنایەت بە تەنها شارەزای دین بێ، بـەڵکو دەبـێ ئاشـنا بـێ بـە ژینـیش، چـونکە کەسـێك شـارەزای دیـن بـێ، بـەڵام ئاشـنای ژیـن نـەبێ و، نـەزانێ کۆمەڵگایەکەی چی تێدایە؟ ئەوکاتە با ئایەتەکانی قورئانی لە بەرین و، شارەزای فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بـێ و سـوننەتەکانی بزانـێ، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی شارەزای واقیعەکەی خۆی نیە، ناتوانێ ئایەتەکانی قورئان و دەقـــەکانی ســـوننەت، لـــە شـــوێنەکانی خۆیـــان دا بەکاربهێنێت.

## ٩- ڕاستیی و ساغیی:

کەسـێك بیـەوێ وەك سـەرکردە تەماشـا بکـرێ، دەبـێ ڕاست بێ لەگەڵ خوا و لەگەڵ خـۆی و خەڵکدا و، سـاغ و

بێ خڵتە بێ و، ڕاست و دروست و بێ غەش بێت، خوای کاربەجێش ڕاستیی و ساغیی خەڵکی کردۆتە ئامانجی دابەزێنرانی قورئانی بە پێز وەك فەرموویەتی: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾﴾. التكوير(٢٨،٢٧)

واتە: ئەم (قورئان)ە تەنها بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان، بۆ هەر کامێکتان بیەوێ ڕاست و دروست بێ.

## ١٠- پشت بە خوا بەستن:

کەسی سەرکردە لە ئیسلام دا، دەبێ زۆر پشت بە خوا بەستوو بێت و، پشتی بە خوا قایم بێ و، پشت بە هیچ کەسێکی دیکە نەبەستێ و، دڵی بە هیچ شتێکی دیکەوە پەیوەست نەبێت، دەستی بە هۆکارەکانەوەبێ، بەڵام دڵی بە خواوە پەیوەست بێ.

## ١١- دڵسۆزیی بۆ هەموو لایەك:

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: (الدین: النصیحة)[1] واتە: دینداریی بریتییە لە دڵسۆزیی، نەك بفەرمووی: ئیسلام بریتییە لە دڵسۆزیی، (دین) لێرەدا بە مانای دینداریی (تدین)ە، فەرموویەتی: دینداریی دڵسۆزییە

---

١) أخرجه مسلم: ٥٥.

پێیان گوتوە: بۆ کێ؟ فەرموویەتی: بۆ خوا و بۆ کتێبی خوا و بۆ پێغەمبەری خوا بۆ بەرپرسانی مسوڵمانان و مسوڵمانان بە گشتیی.

١٢- پاراستنی نهێنیی:

دیارە بۆ هەموو مسوڵمانێك ئەو سیفەتە پێویستە، بەڵام بە تایبەت بۆ کەسی سەرکردە پێویستترە، ئەگەرنا هەموو سیفەتەکانی دیکەش بە گشتیی بۆ مسوڵمانان پێویستن، بەڵام بۆ کەسێك کە سەرکردە و فەرماندە بێ و سەرمەشق بێ بۆ خەڵك ئەو سیفەتانە بۆ ئەو پێویستترن.

١٣- دادگەریی:

دادگەریی یەکێکە لەو بەها بەرزانەی کە خوای پەروەردگار لە ئایەتی (٢٥)ی سوورەتی( الحدید) دەفەرموێ:﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ...﴿٢٥﴾﴾: هەموو پێغەمبەرانمان بە بەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ دابەزاندوون، تاکو خەڵك بە دادگەریی ەڕێوە بچن..

دادگەریی بریتیە لەوە، کە مرۆڤ هەقی خۆی وەربگرێ و، هەقی ئەوانی دیش بدات، (العدل هو أخذ ما لك وإعطاء ما عليك)، ئەمە پێناسەیەکی دادگەرییەو دادگەریی لە یەکسانییەوە نزیکە.

## ١٤- بەزەیی و پەرۆش

کەسی سەرکردە لە ئیسلامدا دەبێ دڵی پڕ بێ لە بەزەیی و پەرۆش بەرامبەر بە خەڵکی دەوروبەری و بەرامبەر بە خەڵکی دیکەش بەگشتیی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ارْحَمُوا مَنْ فِي الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ)(١). واتە: بەزەیی لەگەڵ خەڵکی سەرزەوی بنوێنن، ئەو کەسەی لە ئاسمانە (خوا) بەزەیی پێتان دادێ.

## ١٥- وردبینیی و دووربینیی:

سەرکردە دەبێ هەم ورد ببینێ و هەم دوور ببینێ، وردبینێ واتە سەرکێڵ و درشتکێڵ نەبێ، کە تەنیا ئەو شتانەی ڕووکەش و ڕواڵەتیین بیانبینێ، بەڵکو دەبێ چاو

---

١) أخرجه الترمذي: ١٩٢٤، وصححه الألباني.

ورد بکاتەوە و، دووریش ببینێ، واتە: هەر ئێستای لەبەرچاو نەبێت و، ئاییندەی نیزیك و دووریش ببینێ.

## ١٦- هێز و شایستەیی:

کەسێك دەتوانێ سەرکردە بێ کە هێزی هەبێ سەرەتا هێزی دڵ و دەروون، هێزی عەقڵ و، هێزی زانیاریی، دوایی هێزی ئاکار و ڕەوشت، پاشان هەوڵبدات شایستەیی(کفاءة) لە خۆیدا بێنێتەدی، کە ئەمەش چەمکێکی فراوانی هەیەو، دەتوانین بڵێین: کۆی ئەو سیفەتانەی لەم تەوەرەدا دەیانخەینەڕوو، پێکهاتەکانی ئەو شایستەییەن.

## ١٧- ڕۆشنبیریی و بەرچاوڕوونیی:

کەسی سەرکردە لە ئیسلامدا دەبێ ڕۆشنبیر بێ، بەرچاوڕوون بێ، خوای زانا و توانا فەرمان بە پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (علیه الصلاة والسلام) دەکات دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ یوسف (١٠٨)

واتە: ئەمە ڕێبازی منە خۆم و ئەوانەی شوێنم کەوتوون لەبەر ڕۆشناییدا بەرەو لای خوا بانگەواز دەکەم، مسوڵمان دەبێ ڕۆشنبیر بێ و، عەقڵ کراوە بێ و، بەرچاوڕوون بێ لە دین و ژینی خۆی و دەوروبەری و کۆمەڵگاکەیدا.

## ١٨- دەستپاکیی:

پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) لـە کۆمەڵگایەکـەی خۆیـدا پیاوی ئەمین و ساغ و ڕاستگۆ ناسراو بووە، بەر لـەوەی ببێتـە پێغەمبـەریش. بۆیـە خۆڕازاندنـەوە بـەو خەسـڵەتە بـەرزە پێویسـتییەکی حەتمییـە، بـۆ هەرکەسـێك بەتـەمای پێشەوایەتیی و سەرمەشقێتی بێ.

## ١٩- ویستی بەهێز و مەحکەم:

بـــەبێ خـــاوەن بـــوونی ئـــیرادەو ویســـتێکی بـــەهێز سەرکردایەتییکردن ناکرێ، بەتایبـەتی سـەرکردایەتییکردن لە نێو کارو چالاکی ئیسلامییدا، لەم ڕۆژگـارەدا کـە ئـەهلی کوفر بالآدەستە، دەبێ خـاوەن ئیرادەیـەکی پـۆلایین بـی، ئەگەرنا دەگونجێ ناوت سەرکردە بـێ، بـەلآم لەگـەڵ هـەر پشوە بایەك بنووشـتێیەوە و بـەملاو ئـەولادا و، پاشەکشـە بکەی و، وەفادار نەبی لەگەڵ پڕەنسیپەکانت، ئەوکاتە هەر عەیبداریی و گوناهباریيت بۆ دەمێنێتەوە.

## ٢٠- خۆڕاگریی و نەلەخشان:

ئەمەش بەگشتیی بۆ هەموو مسوڵمانان پێویستە، بەلآم کەسێك کە بەرپرس بێ و کەڵکەڵەی ئەوەی هەبێ پـێش خـەڵك بکـەوێ و، چاوسـاغ و سەرمەشـقی خـەڵك بـێ، بـۆ

دینـداریی و دنیـاداریی ڕاسـت و دروسـت، بێگومـان بـەبێ خۆڕاگریی و نەلەخشان، كارەكەی مەیسەر نابێ.

## ٢١- سینگ فراوانیی و بە حەوسەلەیی:

هەیـە دڵـی گچـكەیە، كـوردەواریی خۆمـان دەڵـێن: {فلاَنكەس دڵی گچكەیە، وەك شارە مێروو وایە، بە دڵۆپـە ئاوێك وێران دەبێ}، مرۆڤ نـابێ بـە شـتێكی كـەم دڵـی پـڕ بێت، مووسا (علیه الصلاة والسلام) كاتێك خوای پـەروەردگار فەرمانی پێ دەكات بچێتە لای فیرعەون، یەكـەمین داوا كـە لە خوای دەكات: ﴿قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ٢٥﴾ فەرمووی: پەروەردگارم! سینەم فراوان بكـە، ئەگـەر سینەت فـراوان بوو ئنجا ﴿وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ٢٦﴾ كاریشـم ئاسـان بكـە، ئەگـەر سینەت فراوان بوو كاریشت ئاسـان دەبێ، ئەگـەر سـینەت فراوان بوو و كاریشت ئاسان بوو، ئنجا زمانیشت باشتر گۆ دەكـات: ﴿وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ٢٧ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ٢٨﴾ گرێیـەك لە زمانم بكەوە بۆ ئەوەی لە قسـەم تـێ بگـەن، بەڕاسـتیی سـینەفراوانیی و بـە حەوسـەڵەیی و خـۆ پاراسـتن لـە تەنگەپرێسـكەیی و زوو توورەبـوون، زۆر گرنگـە، زانایـان گوتوویانـە: (آلَـةُ الرِّئاسَـةِ سَـعَةُ الصَّـدْرِ)، واتـە: ئـامرازی سـەرۆكایەتیی بریتیـە لـە سـینەفراوانیی، كەواتـە: بـەبێ

دڵگەورەیی و سینە فراوانیی و بەحەوسەڵەبوون، گەورایەتیی و سەركردایەتیی ناكرێ.

## ٢٢- ئازایەتیی و فیداكاریی:

هەر كەسێك ئازا نەبێ و فیداكار نەبێ و ڕۆحی لەسەر لەپی دەستی نەبێ، بە تایبەت لەم ڕۆژگارە ترش و تاڵ و پڕ دژوارییی و مەینەتییانەدا، كە بۆ ئەهلی ئیسلام هاتۆتە پێش، با ئەوە لە دڵی خۆی بێنێتەدەر كە ببێتە سەركردە با بۆخۆی مسوڵمانێكی ئاسایی بێ، بەڵام بە تەمای ئەوە نەبێ، سەركردە و سەرمەشق بێ و، پێشەوا بێ و لە پێشەوە بێت.

## ٢٣- بەخشندەیی و بەرچاوتێریی:

وەك دواتر باسی دەكەین پێغەمبەری كۆتایی (محمد) (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: دوو سیفەت خراپترین سیفەتن كە لە كەسێكدا هەبن: یەكەم: چرووكیی و دووەم: ترسنۆكیی: (شَرُّ مَا فِي الرَّجُلِ شُحٌّ هَالِعٌ ، وَجُبْنٌ خَالِعٌ).

ئەم دووسیفەتە چرووكیی و ترسنۆكیی پێكەوەن، ئازایەتیی و سەخاوەتمەندییش بەزۆریی پێكەوەن، هەیە پێی خۆشە بەرپرس و سەرمەشق بێ، بەڵام چرووكە و سەخیی نیە و دڵی گەورە نیە و بەرچاوتێر نیە، یاخود

کاتێك دراوسێیەکی یان دۆستێکی کۆنی دەبینیٚ خاوەنی ئیمکانییەتی زۆرە، خۆی زۆر بە مەغدوور دەزانێت، بیٚ ئاگا لەوەی کە تۆ ئەگەر ڕاست بکەی، ئەو ئیمان و تەقوا و مسولمانیەتییەی کە لە لای تۆ هەیە، نەك هەر بە سەرمایەی مەزن، بەلکو دەبیٚ بە گەورەترین شتی دابنێی کە لە بووندا لەلای تۆ هەیە، ئنجا تۆ چۆن بەشی خۆت پیٚ کەمە و، هی خەلکت پیٚ زۆرە و چاوی تیٚ دەبڕی و، خۆت پیٚ کەمبەش و بێبەشە ؟!

## ٢٤- متمانەپێکراوەیی:

کەسی سەرکردە لە نێو مسولماناندا دەبیٚ متمانە پێکراو بیٚ، ئەویش بەوە دەبیٚ کارێکی وا بکات و وا مامەلە بکات، کە خەلك متمانەو باوەڕی پیٚ بکات، بێگومان متمانەپێکراوییش، دەرەنجامی هەبوونی کەسایەتییەکی مەحکەم و دامەزراو و ئومێدی خێر لێکراوە.

## ٢٥- ڕاوێژکردن:

بەبیٚ ڕاوێژکردن بە دەوروبەر، مرۆڤ ناتوانیٚ سەرکردەی سەرکەوتووبیٚ، بۆیەش ئەنەسی کوڕی مالیك (خوای لیٚ ڕازی بیٚ) گوتوویەتی: (مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ مَشُورَةً لِأَصْحَابِهِ مِنْ

رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) [١]. واتە: هیچ کەسێکم نەبینیوەلە پێغەمبەری خوا زیاتر ڕاوێژ بە هاوەڵەکانی بکات، دیارە لەو شتانەدا، کە دەقیان لەسەر نەبووەو وەحیی پێی نەفەرمووە و، بۆ عەقڵی خۆی و هاوەڵانی بە جێهێڵدراوە، ڕاوێژی پێ کردوون.

## ٢٦- نەخشەکێشان:

سەرکردایەتییکردن، بە بێ نەخشەکێشان و دیارییکردنی ئامانجەکان و دیارییکردنی ئامرازەکان و قۆناغبەندیی کارەکان ناکرێت.

## ٢٧- ڕێکخستن:

دوای ڕاوێژکردن و نەخشەکێشان، دەبێ کارەکان ڕێکبخرێن و دابەش بکرێن و قۆناغبەندیی بکرێن و، کارو چالاکیی ئەندام و کاراکتەرەکانیش بەشێویەکی ڕێك و پێك و سیستماتیك (مُنَظَّم) دابەش بکرێن.

## ٢٨- باش گوێگرتن و تێگەیشتن:

هەر کەسێك بیەوێ سەرکردە و سەرمەشقی خەڵك بێ و چاوساغیان بێ، دەبێ باش گوێ بۆ خەڵك بگرێ، زۆر جار

---

١) الترمذي: ١٧١٤.

گوتوومە و دەڵێم: عاقڵ ئەو کەسەیە بە عەقڵی خەڵك خۆی دەوڵەمەند بکات و، زانا ئەو کەسەیە بە زانیاریی خەڵك خۆی دەوڵەمەند بکات، بەلاَم کەسێك پێی وابێ، هێندە عەقڵی هەیە پێویستیی بە ڕاوێژ کردنی کەس نیە و، هێندەی زانیاریی هەیە پێویستیی بە پرسیارکردن لە کەس نیە، ئەوە لەڕاستییدا بە هەژاریی و بە ئاتاجیی دەمێنێتەوە لە ڕووی عەقڵ و زانستەوە.

## ٢٩- داهێنان و عەقڵ فراوانیی:

کەسی سەرکردە دەبێ توانای داهێنانی هەبێ، نەك حاڵەتێکی دۆگمایی هەبێ، لە چوارچێوەیەکی قاڵب بەستوو و وشکدا خۆی قەتیس بکاو، نەتوانێ لەو قاڵب و لەو چوارچێوەیە بچێتە دەر، مادام کۆمەڵگا دەگۆڕێ مادام دەوروبەرمان دەگۆڕێ، مادام ژینگە دەگۆڕێ و مرۆڤەکان دەگۆڕدرێن، ئێمەش پێویستە جۆری بیرکردنەوەی خۆمان و جۆری مامەڵەی خۆمان لەگەڵ دەوروبەرێکی گۆڕاودا بگۆڕین و چاوی پێدا بگێڕین، هەڵبەتە لە شتە وردەکاندا ئەگەرنا لە هێڵە گشتییەکاندا بێگومان شەریعەت بۆی دیاریکردووین، بەلاَم لەوانەدا کە لە مەودای عەقڵی بەشەردان و لە مەودای تێفکرین و ئیجتیهادی مرۆڤدان، پێویستە هەمیشە دەرگای ئیجتیهاد و کۆششکردن و

داهێنان و تازەگەریی لەلای ئێمە، کراوە بێت، هۆکارێکی زۆر کاریگەری دواکەوتوویی مسوڵمانان، ئەوەیە کە مسوڵمانان و ئۆممەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) زیندوون، بەلاّم حوکمکراو(محکوم)ی مردووانن، زۆر لە مسوڵمانان چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، چ لە ڕووی پەرستشەکان و، چ لە ڕووی هەڵسوکەوتەکانەوە، چ لە ڕووی مامەڵەو بازرگانییەوە، چ لە ڕووی سیاسەتەوە، مەحکوومی ئەو فتوایانە و ئەو بیروبۆچوون و ئیجتیهادانەن، کە زانایان کاتی خۆی بوویانن، ئێستاش لەگەڵدا بێ هەندێك کەس پێی وایە کە دەتوانین بە کتێبەکەی الماوردي (الأحکام السلطانية) یان (أبو يَعلى)، کە ئەویش بەهەمان شێوە کتێبێکی هەیە بەناوی (الأحکام السلطانية)، یان کتێبەکەی أبو حامد الغزالي (التبر المسبوك في نصائح الملوك) یان (بدائع الملك)، یان کتێبەکەی إبن تيمية (السياسة الشرعية)، دەتوانین کۆمەڵگا بەڕێوەبەرین، بەلاّم نەخێر ئەوان بۆ ڕۆژگاری خۆیان هەندێك ئیجتیهادیان کردوە، هەڵبەتە ئەوەی کە قورئان و سوننەتە، ئەوە هەر لە جێی خۆیەتی، بەلاّم بۆ تێگەیشتن لە قورئان و سوننەت و چۆنییەتیی مامەڵەکردن

لەگەڵ دەوروبەر و کۆمەڵگادا، دەبێ عەقڵی خۆمان زۆر بکەینەوە و داهێنان بکەین و دڵی خۆمان فراوان بکەین.

### ٣٠- بڕیاردان:

سەرکردە دەبێ توانای بڕیاردانی هەبێت، هەڵبەتە بڕیاردان دوای هەموو ئەو شتانەی باسم کردوون، دوای نەخشەکێشان، ڕاوێژکردن، ڕێکخستن، باش گوێ گرتن ئنجا عەقڵی خۆ فراوان کردن و داهێنان، دەبێ توانا بڕیاردانیش هەبێ.

### ٣١- سەلیقەی کۆمەڵایەتیی:

ئەمەش خەسڵەتێکی زۆر گرنگە، هەندێك کەس شارەزایی هەیە لە قورئانداو لە سوننەتی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام)، بەلاّم عەقڵ و سەلیقەی مامەڵەی کۆمەڵایەتیی نیە، خەڵکی وا هەیە، برا و خوشکەکانی خۆی و خزمەکانی خۆی بە دەستییەوە گرفتارن و، نازانێ مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، باب و دایکی خۆی بە دەستییەوە گرفتارن! ئنجا بابای وا چۆن دەتوانێ کۆمەڵگا ئاسوود و بەختەوەر بکات و، ڕێیان پێشان بدات و، دڵی خەڵك خۆش بکات، تۆ نەتتوانی بێت برا و خوشکەکانی خۆت ڕازی بکەی، دایك و بابت لە سنووری شەرع دا، ڕازی بکەی و

دڵیان نەرم بکەی چوار قسەت لێ وەربگرن، بووی بە بەردی خڕ!! بەڵێ، سەلیقەی کۆمەڵایەتیی زۆر گرنگە بۆ هەموو کەس، بەتایبەتی بۆ کەسێك کە بیەوێت سەرمەشق و سەرکردە بێ لە نێو کۆمەڵگادا.

## ٣٢- هاندان و ورە وەبەرنان:

سەرکردە دەبێ خەڵك هان بدا و ورەیان وەبەرنێ و، دەبێ داینەمۆیەك بێ بۆ تیژکردنی خەڵك و وزەدانە بەر خەڵك، هەیە بەرپرسە، بەڵام قسەی وا دەکات ئەژنۆی خەڵك دەشکێنێ و، ئیرادەی خەڵك دەمرێنێت، سەرکردایەتیی بەوجۆرە ناکرێ، بەڵکو سەرکردە لە کاتی لێقەومان و قەیرانانیشدا هەمان ئەو متمانەیەی کە بە خوای خۆی هەیەتی و بەکارەکەی خۆیەتی، متمانەکەی خۆی لە دەست نادات.

## ٣٣- ڕوون و ڕاشکاوبوون:

سەرکردە پێویستە ڕوون و ڕاشکاو بێ و، نابێ بە منجە منج قسە بکات، بەڵکو دەبێ لەگەڵ خەڵك دا ڕوون و ڕاشکاو بێ و ڕاست و ساغ بێ، پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (علیه الصلاة والسلام) وابووە، شتێك بوو بێ ڕوون و ڕاشکاو بە هاوەڵانی گوتوە، گلەییەکی لێیانی بووبێت، پێی

فـــەرموون، ئەگـــەر ئـــەوان گلەييـــەكيان هەبووايـــە، پێـــى فەرموون: گلەييەكەتان چييە ؟ بۆى ڕوون كردوونەوە، بۆيە ڕوون و ڕاشكاويى زۆر گرنگە بۆ هەموو كەس، بەتايبەت بۆ كەسێك كـە بيـەوێت سـەركردايەتيى بكـات لـە نێـو ئـەهلى ئيسلام دا.

## ٣٤- ڕووگەشيى و قسەخۆشيى:

ئەمــەش سـيفەتێكى زۆر گرنگــە، پێغەمبــەرى كۆتــايى (**محمد**) (عليه الصلاة والسلام) هەميشـە دەم بـە زەردەخەنـە بـــووە، هەميشـــە ڕووخـــۆش و قســـە شـــيرين بـــووە، پێغەمبــەر(عليه الصلاة والسلام) دەفــەرموێ: (الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ) [١] قسەيەكى خـۆش خێـر و چـاكەيە، دەفـەرموێ: (تبسُّمُكَ في وجهِ أخيكَ صدقةٌ) [٢] زەردەخە لە ڕووى برا مسـولْمانت دا سـەدەقە و خێـرە، كەچـى هـى وا هەيـە وا دەزانێ لە دينداريى و تەقوايە مڕومۆچ و نێوچەوان گرژ بـى و، قسەت ترش و تـالْ بىْ، نـەك هـەر ئەوەنـدە بـەڵكو بـێ بەزەيى و ڕەق بێ بەرامبەر بە برا و خوشـكە دينييـەكانى، بـەلاْم هەنـدێك لەوانـە تەماشـا دەكـەى بەرامبـەر بـە بـرا و خوشكە بێ دينەكانى زۆر نەرم و نۆڵە ! كەچى لەگەڵ برا و

١) أخرجه البخاري (٢٩٨٩)، ومسلم (١٠٠٩) مطولاً. (صحيح البخاري)
٢) أخرجه الترمذي (١٩٥٦) واللفظ له، وابن حبان (٥٢٩).

خوشکه دینداره‌کانی دا زۆر ڕه‌ق و تونده!! ده‌بێ له‌گه‌ڵ هه‌موو که‌س دا ڕووت خۆش و گه‌ش بێ، هه‌ڵبه‌ته له حاڵه‌تی هه‌ڵس و که‌وت و مامه‌ڵه‌دا، به‌ڵام له حاڵه‌تی ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌دا، بێگومان مسوڵمان ده‌بێ شێری چنگ به خوێن بێ و، به‌رامبه‌ره‌کانی سامی لێ بکه‌ن.

## ٣٥- چاوپۆشیی و لێبوردن:

سه‌رکردایه‌تیی و فه‌رمانده‌یه‌تیی و سه‌رمه‌شقایه‌تیی به‌بێ چاوپۆشیی کردن له هه‌ڵه و که‌موکوڕییه‌کان و، به‌بێ لێبوردن ناکرێت، له چه‌ند شوێنان خوای په‌روه‌ردگار به پێغه‌مبه‌ری کۆتایی (محمد) (علیه الصلاة والسلام) ده‌فه‌رموێ: ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡ﴾[1]، ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾[2]، ڕوویان لێ وه‌رگێڕه، چاوپۆشییان لێ بکه، لێیان ببووره، چونکه به‌بێ چاوپۆشیی مامه‌ڵه‌ی ته‌ندروست ناکرێت، نه‌ك هه‌ر له قۆناغی مه‌ککه‌دا، به‌ڵکو له مه‌دینه‌ش پێغه‌مبه‌ری کۆتایی (محمد) (علیه الصلاة والسلام) به‌رامبه‌ر به هاوه‌ڵانی (خوای لێیان ڕازی بێ)، ئه‌وه‌نده‌ی له

---

١) المائدة: ١٣.

٢) النساء: ٨١.

شــەرع دا جێـی بووبێتــەوە، چاوپۆشـیی لـێ کـردوون و لێبوردنیی لەگەڵیاندا هەبووە.

## ٣٦- خاکیەتیی و بێ فیزیی:

ئەمــەش سـیفەتێکی زۆر جوانــە پێغەمبــەر (علیه الصلاة والسلام) دەفــەرموێ: (وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ)[1] هیچ کەسێك لەبەر خوا خۆی بە کەم نەگرتوە، مەگەر خـوا بــەرزی کردۆتــەوە، هەیــە هــەر لەگــەڵ نــاوی چــووە ســـەرکردایەتیی و ئەنجوومـــەنی سیاسـیی و، بەرپرســی مەڵبەند و کارگێڕ و...هتد، لە خۆیەوە هەوایەکی دەچێتە کەللە، یان کە بوو بە وەزیر یان پەرلـەمانتار، لـە خـۆوە وا دەزانێ بووەتە شتێکی دیکە ! زۆرجار گوتوومـە: پێـوەری هەڵســەنگاندن بـۆ هــەر کەسـێك، ئەوەیــە ئــەو پۆســتەی هەیــەتی، ئنجــا ئەگــەر وەزیــرە، ئــەمیرە، ســەرۆکە، پەلەمانتارە، ئەندامی سەرکردایەتییە... لێی وەربگرەوە و وەك خــۆی تەماشــای بکــە، بەهایەکــەی چــەندە، ئــەوە حەقیقـەتی خۆیـەتی، چـونکە ئـەوەی بـە هـۆی پۆسـتەوە پەیدای کردوە، هی خۆی نیە، مرۆڤ دەبێ لـە زاتـی خۆیـدا شتی لە باراندا هەبێ و، لە خودی خۆیدا هـەبێت، نـەك بـە

١) أخرجه مسلم: ٢٥٨٨.

هۆی پۆست و پێگەکەیەوە، بۆیە بێ فیزیی مرۆڤ جوان دەکات، بەلاَم خۆبەزلگریی و لە خۆ ڕازیی بوون و خۆ پەسندیی، مرۆڤ ناشیرین دەکات.

٣٧- ڕابردوو پاکیی:

ئەمەش سیفەتێکی زۆر گرنگە کە مرۆڤ ڕابردووی پاك بێ و لەکە و پەڵەی پێوە نەبێت، هەڵبەتە ئەگەر کەسێکیش کەموکوڕی هەڵە و پەڵەیەکی هەبووبێ، بەلاَم باش بگەڕێتەوە لای خوا و، دان بە هەڵەکانی خۆی دابنێ و، پەریزی خۆی پاك بکاتەوە، ئەوەش بێگومان هەر دەبێ، بەلاَم کاتێك چاو دەگێڕین بۆ دانانی بەرپرسێك، دەبێ تەماشای پەرێزی ڕابردووی بکەین، چونکە مرۆڤ زۆر بە زەحمەت خۆی بۆ دەگۆڕدرێ، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: {خووی شیریی هەتا پیری}، هەر کەسێك بە چییەوە ڕاهاتبێ، هەر ئاواش دەچێتەدوو.

٣٨- قبووڵکردنی قسەی هەق و ڕەخنەی بەجێ:

ئەم خەسڵەتە زۆر گرنگە بۆ هەر کەسێك سەرکردە و سەرمەشق و چاوساغ بێت بۆ مسوڵمانان، دەبێ قسەی هەق قبووڵ بکات و ڕەخنەی بەجێ وەربگرێ، بەڵکو دەبێ سوپاسی ئەو کەسەش بکات، کە ڕەخنەکەی لێ دەگرێ و

قسەكەی پێ دەڵـێ، هەڵبەتـە خـەڵكیش دەبـێ لـە قـاڵبی ئەدەبدا و لە چوارچێوەیەكی ئیسلامییدا، ڕەخنـەی خۆیـان بگرن و قسەی خۆیان بكەن، نەك خـۆ هەڵكێشـان بـێ و بڵێ: لە فلان كۆنفرانس و لە فلان كۆنگرە و كۆبوونـەوەدا، ئاوا و ئەوهام بە فلانكەس گوت! نابێ ڕەخنە و سەرنجەك بۆ هەوای نەفس و شكاندنی بەرپرسـەكە و ئیحـراج كردنـی بـێ، بـەڵكو دەبـێ بـۆ چـاككردنی بێـت، ئنجـا دەبـێ بـە شێوازی شەرعییانە و ڕێك بێ.

## ٣٩- پاداشت و پێزانین بۆ چاكەكاران:

ئەوانـەی چـاكەكارن دەبـێ پێزانینمـان بۆیـان هـەبێ و پاداشت و دەستخۆشییان بۆیان هەبێ.

## ٤٠- لێپرسینەوە و سزا بۆ لادەر و خراپەكاران:

بـەبێ پاداشـت و پێـزانین، لەولاشـەوە: لێپرسـینەوە و سزا، مرۆڤ ناتوانێ سـەركردە بـێ و نـاتوانێ سەرپەرشـتیی خەڵك بكا، خوای پەروەردگار بە خوایەتیی خۆی، پاداشتی داناوە بۆ چاكەكاران و، سزاشی داناوە بۆ خراپەكاران.

(ذو القـرنين)یـش، كـە سـەركردەیەك بـووە، خـوا بەسـەرهاتەكەی بۆمـان گێڕاوەتـەوەو ستایشـی كـردوە،

سیاسەتی وابووە: پاداشتی چاكەكاران بداتەوەو، سزای خراپەكار و ستەمكارانیش بدات، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿قُلۡنَا يَٰذَا ٱلۡقَرۡنَيۡنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمۡ حُسۡنٗا ﴿٨٦﴾ قَالَ
أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوۡفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا نُّكۡرٗا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا
مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنۡ أَمۡرِنَا يُسۡرٗا
﴿٨٨﴾﴾ الكهف: ٨٦–٨٨.

واتە: گوتمان: ئەی زەلقەرنەین! بۆت هەیە –لە مامەڵە لەگەڵ كۆمەڵگایەكان دا– یان سزا بدە، یان چاكەكارییان لەگەڵ بكە پیشە، گوتی: هەركەس ستەم بكات ئێمە سزای دەدەین و دوایی دەگێڕرێتەوە لای پەروەردگاری و سزایەكی سەختی دەدات، هەر كەسیش بڕوا بێنێ و چاكە بكات، پاداشتی هەرەباشی هەیەو ئێمەش قسەیەكی خۆش و ئاسانی لەگەڵدا دەكەین.

لێرەدا شەش (٦) تایبەتمەندیی دەخەینەڕوو كە هەندێكیان تا ڕاددەیەك وێكچوونییان هەیە، لەگەڵ ئەو چل خاڵەی خستماننەڕوو لە بارەی خەسڵەتەكان و ئەركەكانی كەسی سەركردە، بەڵام جیاوازیشیان هەیە، ئنجا هەر سەركردەیەك بیەوێ سەركەوتوو بێ، پێویستە ئەو شەش تایبەتمەندییە لە كارەكەیدا هەبن:

## یەكەم: كاراكردنی كاری هەرەوەزیی

دەبێ كەسی سەركردە هەمیشە هاندەر بێ و كارێكی وا بكات، كە كاری هەرەوەزیی و پێكەوەیی، لە گەرموگوڕی و گەشەپێدان دابێت، ئەمیش بە چەند شتێك:

١. دیارییكردنی ئامانجە هاوبەشەكان و، هاوكاریی لەسەر كردنیان.
٢. باش دابەشكردنی كارەكان و ڕێكخستنیان.
٣. ڕاوێژكردن بە بەردەوامیی.
٤. دروستكردنی تۆڕێكی سەركردایەتیی كە كار بۆ دامەزراوەكان بكەن، نەك كار بۆ مەجدی شەخسیی خۆیان بكەن.
٥. فریو نەخواردن بە دڵگەرمیی هەندێك لە شوێنكەوتووان، واتە: حیسابی خۆی تێك نەدا بۆ خەڵكێك كە دێت هەڵی

دەپێچێ و، هانی دەدا بۆ شتێك، کە بۆ خۆی عەقڵی نایبڕێ و، بە بێ بەڵگە، دەیەوێ کارێك بکات.

٦.ستایشکردنی خەڵك لەسەر ئەنجامدانی کاری چاك.

٧.کارلێکی سەرکردە لەگەڵ ئەندامەکانی دا.

ئەمانە بڕگەکانی کاراکردنی کاری هەرەوەزیین، کە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی کاری سەرکردەی سەرکەوتووە .

## دووەم: هێنانە پێشی خاوەن وزە و توانا تازە پێگەیشتووەکان

سەرکردەی سەرکەوتوو، هەرگیز هەستیاریی نیە کەسێك یان بە کەسانێك، کە وزە و توانای تازەیان پێیە، بەڵکو هەمیشە خوا خوایەتی یەکێکی دیکەی بۆ زیاد بێ و یەکێکی دیکەی بۆ هەڵبکەوێ:

١- ئەگەر تەماشا بکەین مووسا (علیه الصلاة والسلام) وەك لە سوورەتی (القصص) ئایەتی (٣٤)دا هاتوە، دوای ئەوەی خوای پەروەردگار ئەرکداری دەکات بچێتە لای فیرعەون، مووسا دەفەرموێ: ﴿ وَأَخِي هَـٰرُونُ هُوَ أَفْصَحُ مِنِّي لِسَانًا فَأَرْسِلْهُ مَعِيَ رِدْءًا يُصَدِّقُنِيٓ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ﴿٣٤﴾ ﴾.

واتە: هاڕوونی براشم ئەو زمانی لە من پاراوترە، بینێرە لەگەڵم پشتم بگرێ، من دەترسم ئەوان بە درۆم دابنێن،

شتێکی زۆر گرنگە، هارووون لەسەر داوای مووسا (علیه الصلاة والسلام) کراوە بە پێغەمبەر، کەچی مووسا مەدحی هارووون دەکات، بە جۆرێك کە خوای پەروەردگار ڕازی بێ، ئەویش ببێتە پێغەمبەر و لەگەڵی بێت، دەڵێ: زمانی لە من پاراوترە.

٢- هەروەها پادشایەکەی میسر، کە مسوڵمانیش نەبووە، بەڵام عەقڵێکی هەبووە کە توانا و وزەکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە: ﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾﴾ یوسف.

دوای ئەوەی پاکیی یوسف (علیه الصلاة والسلام) دەردەکەوێ پادشا گوتی: بۆ منی بێنن تایبەتی دەکەم بە خۆمەوە، واتە: ڕاوێژی پێ دەکەم و دەیکەمە ڕاوێژکاری خۆم و کەسێك کە کارەکانی خۆمی پێ دەسپێرم، ئەوە نیشانەی عاقڵیی ئەو پادشایە بووە.

٣- پێغەمبەری کۆتایی (محمد)یش (علیه الصلاة والسلام) فەرمایشتی زۆرن، لەو بارەوە لە مەدحی هاوەڵانیدا، بۆ وێنە لە یەکێکیان دا دەفەرموێ: (خذوا القرآن من أربعة: من عبدالله ابن مسعود ، وسالم مولى أبي حذيفة، ومعاذ بن جبل، وأبي بن كعب)[1].

---

١) البخاري: ٣٨٠٨ .

واتــە: قورئــان لــەو چــوار کەســە وەربگــرن: عبــدالله کــوڕی مەســعوود، ســالم مــەولای ئــەبی حوزەیفــە، موعــازی کــوڕی جەبەل، ئوبەی کوڕی کەعب. (خوا لە هەر چواریان ڕازی بێ).

## سێیەم: دیارییکردنی خاوەن توانایەکان

سەرکردە دەبێ چاو بگێـڕێ بۆ خـەڵك و، ئەوانـەی توانـای تایبەتیان هەیە دیارییان بکا و، دڵی پێیان خۆش بێ و، چـاوی لەسـەریان بـێ و، هەوڵبـدات بیانهێنێتـە پـێش و پـەروەردەیان بکات.

با تەماشای ئەم چەند دەقە بکەین:

أ- پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (علیه الصلا والسلام) دەربارەی ژمارەیەك لە هاوەڵانی ئاوا دەفەرموێ: (أرحَمُ أمَّتي بأمَّتي أبو بَكْر، وأشدُّهم في أمر اللّه عُمرُ، وأصدقُهُم حياءً عُثمانُ، وأقرأُهُم لِكتابِ اللَّهِ أبَيُّ بنُ كَعب وأفرضُهُم زيدُ بنُ ثابت، وأعلمُهُم بالحلالِ والحرامِ مُعاذُ بنُ جبلٍ، ألا وإنَّ لِكُلِّ أمَّةٍ أمينًا، وأمينَ هذِهِ الأمَّةِ أبو عُبَيْدةَ بنُ الجرَّاحِ)[1] .

پێغەمبــەر (علیه الصلاة والسلام) دەفــەرموێ: بــە بــەزەیترین ئۆممەتم بەرامبەر ئۆممـەتم ئـەبوو بـەکرە و، ئـەوەی لـە کـار و

---

١ ) الترمذي: ٣٧٩٠، قال الشاكر في التحقيق: صحيح.

دینـی خـوادا لـە هـەمووان تونـدتر و تونـدوتۆڵترە، عومـەرە و، ئەوەی لە هەمووان شەرم و شکۆی زیاترە، عوسمانە و، ئەوەی لە هـەمووان کتـێبی خـوا باشـتر دەخوێنێتـەوە، ئوبـەی کـوڕی کەعبە و، ئەوەی لە هەمووان لە میرات دا شـارەزاترە، زەیدی کوڕی سابیتە و، شارەزاترینیان بـە حـەلاڵ و حـەڕام، موعـازی کـوڕی جەبەلـە و، هـەموو ئۆممـەتێك ئەمینـدارێکی هەیـە، ئەمینداری ئەم ئۆممەتەش ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحە.

**ب-** (عن ابن عباس أَنَّ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ دَخَلَ الخَلَاءَ، فَوَضَعْتُ له وَضُوءًا قالَ: مَن وضَعَ هذا؟ فَأُخْبِرَ فَقالَ: أللَّهُمَّ فَقِّهْهُ في الدِّينِ)(١).

عبدالله کوڕی عەبباس دەڵـی: پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) ڕۆژێك چوو بۆ سەر ئاو بۆ تارەت گرتن، منیش ئاوێکم بـۆ دانـا بۆ ئەوەی دوایی دەستنوێژی پـێ بگرێ {لە قاپێك لە شـتێك دا ئاوەکەی داناوە، تاکو ئەو تارەت دەگرێ ئاوەکە ئامادە بـێ}، کە هاتـەدەر فـەرمووی: کـێ ئـەو ئـاوەی دانـاوە دوای ئـەوەی هەواڵی پێدرا، دوعای کرد و فەرمووی: ئـەی خوایـە ! لـە دینـدا شارەزای بکە ! ئەو دوعایەی پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) بـۆ عبـدالله کـوڕی عـەبباس وا قبـووڵ بـووە، کـە ئێسـتا ئێمـە لـە تەفسیری قورئاندا، ئـەوەی کـە هـاوەڵان و تـابیعین و زاناکـانی

---

١) البخاري: ١٤٣، مسلم: ٢٤٧٧.

دیكــە هێناویانــە، بــە زۆری دەچــێتەوە ســـەر عبــدالله كــوڕی عەبباس، دوعایەكـەی پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) ئـاوا بـۆی قبـوولّ بـووە، هەرچـەندە كـارێكی بچووكیشـی كـردوە، بـەلاّم لێرەدا مەبەسـتمان ئەوەیـە، كـە پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) توانای عبدالله كوڕی عەبباسی دەرخستوە.

ج- پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً، فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ سِنًّا)(١).

پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بۆ ڕیزبەند كردنـی مسـوڵمانان كـە كۆمـەڵێك پێكـەوە دەبـن، كامیـان پـێش نوێـژیی بكـات؟ دەفەرموێ: كۆمەڵێك كە پێكەوە دەبن، ئەوەیان كە لـە كتـێبی خوادا شارەزاترە، ئەویان دێتە پێشەوە، ئەگەر لە شارەزایی لە قورئان دا یەكسان بوون، كامیان لـە ڕێبـازی پێغەمبـەردا (علیه الصلاة والسلام) شـارەزاترە، ئەگـەر لەوەشـدا یەكسـان بـوون، كامیان پێشتر كۆچی كردوە، ئەگـەر لەوەشـدا یەكسـان بـوون، كامیان تەمەنی زیاترە.

تەماشا دەكەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، ڕیزبەندییەكی وای داناوە، كە دوایی مسوڵمانان بـزانن كـێ پـێش دەخـەن بـۆ

---

١) مسلم: ٦٧٣.

پێشنوێژییەکەیان.

**د- هەروەها ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر** (علیه الصلاة والسلام)، **کە لە نەخۆشیی مەرگیدا، کە کۆچی دوایی پێ کرد، فەرمووی:** ( مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بالنَّاسِ).[1]

**واتە: فەرمان بکەن بە ئەبوو بەکر، با ئەو نوێژ بە خەڵکی بکات، لە شوێنی پێغەمبەری کۆتایی (محمد)** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، **هەتا دایکمان عائیشە،** (خوای لێ ڕازی بێ)، **گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەبوو بەکر پیاوێکی زۆر دڵنەرمە، ئەگەر لە شوێنی تۆ ڕابوەستێ پێشنوێژیی بۆ ناکرێ لەبەر گریان، ئەویش پێشنیارەکەی عائیشەی ڕەتکردەوە، فەرمووی: با ئەبوو بەکر پێش نوێژیی بکا. کە ئەوەش ئاماژەیەك بووە دوایی مسوڵمانان گوتیان:** (من رضيه رسول الله صلى الله عليه وسلم لديننا رضيناهُ لدنيانا).

**واتە: ئەوەی پێغەمبەر** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **پەسندی کردوە کە پێشنوێژییەکەمان بۆ بکات، ئێمەش ڕازین کە سەرکردایەتییشمان بۆ بکات و بیکەینە جێنیشینی پێغەمبەر** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلم) **بۆ حوکمڕانیی.**

---

١) البخاري: ٦٦٤.

## چوارەم: بە حیکمەتەوە مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵەی هەڵەکاراندا

ئەمەش تایبەتمەندییەکی دیکەی گرنگی کەسی سەرکردەیە لە ئیسلام دا، ئەو کەسانەی کە لەگەڵیدا کار دەکەن، فریشتە نین، بەفری بێ پەڵە و فریشتەی بێ هەڵە نین، دەبێ چاوەڕوانییان لێ بکات، هەڵە و کەموکوڕییان هەبێت، ئنجا ئایا دەبێ چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات؟ ئایا هەر کەسێك هەڵەیەکی کرد، دەبێ زەڕبێکی بەسەردا بێنێ؟ نەخێر، چونکە ئەوکات کەسی بەدەورەوە نامێنێ، ئەگەر بە ئینساف بێ، دەبێ پێش هەمووان زەڕب بەسەر خۆیدا بهێنێ، چونکە ئەوەندەی شارەزای هەڵەکانی خۆیەتی، هێندە شارەزای هەڵەی کەس نیە، هەموو دەمێ لەگەڵ خۆیەتی و هەموو هەڵەکانی خۆی دەزانێ، بەڵام هەڵەکانی هەموو خەڵکی ئاوا نازانێ، ئنجا مادام خۆی بەو هەموو هەڵانەوە دەوێ و زەڕب بەسەر خۆیدا ناهێنێ، با زەڕب بەسەر کەسیش دانەهێنێ، بە هۆی هەڵەیەك و دوو هەڵە و چەند هەڵەیەکەوە.

پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەو بارەوە دەفەرموێ: (كل ابن آدم خطاء، وخير الخطّائين التوّابون)[1].

---

١) الترمذي: ٢٤٩٩ و سنده حسن.

واتـــە: هـــەموو ڕۆڵەیـــەکی ئـــادەم زۆر خـــەتاکارە، بـــەلاّم باشترینی خەتاکاران گەڕاوانن بۆ لای خوا، هەر ئەم دەقە لەلای حـــاکم ئـــاوا هـــاتوە: (کـل بنـي آدم خطـاء، وخـیر الخطّـائین التوّابو )[1]. واتە: هەموو وەچەی ئادەم {یان هەموو ڕۆڵەکانی ئـــادەم} هەڵـــەکارن، باشـــترین هەڵـــەکاران، ئەوانـــەن کـــە دەگەڕێنەوە.

ئەگەر تەماشای پێغەمبـەری کۆتـایی (محمـد) (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بکـەین، دەبیـنین: بـەردەوام هەڵـەی بـۆ خـەڵك ڕاسـت کردۆتەوە، بەلاّم چەند بە نەرمیی و جوانیی و میهرەبانیی!

بۆ وێنە:

١) لـــە (صـــحیح البخـــاري ومســـلم)دا هـــاتوە: (عمـــر بن أبي سلمة)، کـە لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا بووە (علیه الصلاة والسلام)، خزمەتی کردوە، دەڵێ: تەمـەنم دە سـاڵ بـوو، دایکـم بردمـی بـۆ خزمـــەت پێغەمبـــەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، دەڵـــێ: (وكانَتْ يدُ تَطيشُ في الصَّحْفَة) ئـەو قاپـەی کـە خواردنمـان تیایـدا دەخـوارد، دەسـتم تـێ دەگێـڕا، دیـارە بـە دەسـتی چەپیشی خواردوویەتیی و (بسم الله)یشی نەکردوە، پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فـــــەرمووی: (یـا غـلامُ، سَـمِّ اللَّهَ، وكُـلْ

---

١) وقال: صحیح: ٧٦١٧.

بَيمينِك، وكُلْ مِمَّا يليك)[1] لە یەك ڕستەدا سێ ئەدەبی فێر كردن، فەرمووی: ئەی ڕۆڵە گیان! ناوی خوا بێنە پێش خواردن و، بەدەستی ڕاستیشت بخۆ و، لە پێش خۆشتەوەش بخۆ، سێ هەڵەی بۆ ڕاستكردنەوە، بەلآم چەند بەنەرمیی و بەجوانیی فەرمووی: (یا غلام) واتە: ئەی ڕۆڵە، ئەی كوڕیژگە !

٢) هەروەها لە (صحيح البخاري)دا هاتوە، كە كەسێك میزی لە مزگەوتیّ كردوەو، هاوەڵان ویستوویانە لێی تێكبدەن، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: (لا تزرموا عليه بوله) میزەكەی لیّ تێك مەدەن لێی مەبڕن، میزی تەواو كردوە، ئنجا بانگی كردوە و فەرموویەتی: ئێرە بۆ میز كردنیّ نیە و شوێنی نوێژ و تاعەتە، فەرمووشیەتی: دۆڵكە ئاوێك بێنە و پێیدا بكە، شوێنەكەش لم و چەو بووە و چووەتە خوار.

٣) هەروەها پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەو هەڵە گەورەیەی حاتەبی كوڕی بەلتەعەی چاوپۆشیی لیّ كرد، كاتێك پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەیەویّ بەرەو مەككە بچیّ بۆ ئازادكردنی مەككە، وەك سزادانی قوڕەیشییەكان، كە هاوپەیمانەكانی وی، كە هۆزی (خزاعة) بوون، هاوپەیمانەكانی قوڕەیش، كە (بنو بكر) بون، خەڵكیان لیّ كوشتبوون، ئەوانیش دێن داوا لە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەكەن، كە

---

١) أخرجه البخاري: ٥٣٧٦.

بەرگرییان لێ بكات، حاتەبی كوڕی ئەبی بەلتەعەش نامەیەك هۆزی قوڕەیش لە مەككە دەنێرێ، عومەری كوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە خیانەتیی كردوە، با بیكوژین و لە گەردنی بدەین، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: (إنَّه قد شَهِدَ بَدْرًا وما يُدْرِيكَ؟ لَعَلَّ اللَّهَ عزَّ وجلَّ اطَّلَعَ علَى أهْلِ بَدْرٍ فَقالَ: اعْمَلُوا ما شِئْتُمْ فقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ)[١] واتە: ئەوە لە جەنگی بەدردا ئامادەبووە، تۆ چووزانیی ڕەنگە خوا تەماشایەكی خەڵكی بەدری كردبێ و فەرموویی: هەرچی دەكەن بیكەن، ئەوە من لێتان خۆش بووم، عومەر(خوای لێ ڕازی بێ)، چاوی پڕ بوو لە فرمێسك.

## پێنجەم: هاندان و ورە وەبەرنان و بڵاوكردنەوەی گەشبینیی

سەركردە هەمیشە دەبێ گەشبینی بڵاوبكاتەوە و، نابێ ئیرادەی خەڵك بمرێنێ:

١) پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: (إذا قالَ الرَّجُلُ : هَلَكَ النَّاسُ فَهو أهْلَكُهُمْ)[٢]. واتە: هەر كاتێك پیاوێك گوتی: خەڵك لە بەین چوون، ئەوە خۆی فەوتاندوونی، یاخود

---

١) صحيح البخاري: ٣٠٠٧.

٢) مسلم: ٢٦٢٣.

خـۆی فەوتاوترینیانـە، ئـەو فەوتانـدوونی واتـە خـەڵك بـەهۆی ئەوەوە دەفەوتێن، بەهۆی بڵاوکردنەوەی قسـەی ڕەشـبینیی و نائومێدییەوە.

٢) هەروەها پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویەتی: (سَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُحِبُّ أَنْ يُسْأَلَ وَأَفْضَلُ الْعِبَادَةِ انْتِظَارُ الْفَرَجِ)[1]. واتە: لە بەخششی خوادا داوا بکەن، خوا حەز دەکات داوای لێ بکرێ و، گەورەترین خواپەرستیی بریتیە لە چاوەڕێ کردنی دەروو لێکرانەوە، چاوەڕێ بکەی خوا دەرووت لێ بکاتەوە، عیبادەتە.

٣) هەر لەو بارەوە با ئەو دەقەش بێنین:

(أَنَّ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ دَخَلَ علَى أعْرَابِيٍّ يَعُودُهُ، قَالَ: وكانَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ إذَا دَخَلَ علَى مَرِيضٍ يَعُودُهُ قَالَ: لا بَأْسَ، طَهُورٌ إنْ شَاءَ اللَّهُ، فَقَالَ له: لا بَأْسَ طَهُورٌ إنْ شَاءَ اللَّهُ، قَالَ: قُلتَ: طَهُورٌ؟ كَلَّا، بَلْ هي حُمَّى تَفُورُ، أوْ تَثُورُ، علَى شيخٍ كَبِيرٍ، تُزِيرُهُ القُبُورَ، فَقَالَ النبيُّ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: فَنَعَمْ إذًا).[2]

عبداللە کوڕی عەبباس دەڵێ: پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) چوو بۆ لای ئەعرابییەك نەخۆش بوو سەردانی کـرد عـادەتی وا

---

١) الترمذي: ٣٥٧١.

٢) البخاري: ٣٦١٦.

بـوو کـە سـەردانی کەسـێکی دەکـرد دەیفـەرموو: هـیچ نیـە پاککەرەوەیە ئەگەر خوا بیەوێ، هەمان شتی بەو ئەعرابییـەش گوت، ئەویش گوتی: وتـت پاککەرەوەیە ؟نـەخێر، بـەڵکو ئـەوە تایەکـە دەکـوڵێ و هەڵدەچـێ لەسـەر پیـاوێکی بـە تەمـەن و دەیهـێنێ بـۆ گۆڕسـتان، پێغەمبـەریش (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: کەواتە باشە، ئیدی ئەوەبوو بەو دەردەچوو.

## شەشەم: مامەڵە لەگەڵ قەیرانەکان دا

سەرکردە دەبێ بزانێ چۆن مامەڵـە بکـات لەگـەڵ قـەیران و کێشە و گرفتەکاندا، کـە دێنـە پـێش، چـۆنیەتی مامەڵـەکردنی ڕاست و دروستیش لەگەڵ قەیرانەکان دا، بە ڕەچاوکردنی ئـەو حەوت بنەمایانەی خوارەوە دەبێت:

١- نەخشەدانان:

پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، چ بـۆ کـۆچ کردنـی لـە مەککـەوە بـۆ مەدینـە، چ بـۆ سـوڵحی حودەیبییـە، نەخشـەی داناوە، هەڵبەتە هەموو ژیانی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بـە بەرنامە بووە، بـەڵام ئەمانـە وەك دوو نموونـە، ئەگـەر تەماشـا بکەین پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بۆ چۆنیەتیی کۆچ کردنـی لـە مەککـەوە بـۆ مەدینـە، زۆر وردەکـاریی کـردوە و، هـەموو ئامادەسـازییەکیی کـردوەو، هـەموو خاڵـەکانی سـەروبەرگرتنی

ئەو كۆچ كردنـەی لەبـەر چـاو گرتـوون، هـەروەها بۆ سـوڵحی حودەیبییەش كە دوایی خـوای پـەروەردگار نـاوی لێنـا (فَتْحًـا مُّبِينًا) واتە: ئازادكردنێكی یان سەركەوتنێكی ڕوون و ئاشـكرا. پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) زۆر بـە نەخشـەیەكی ورد و بـە كارامانــە و لێزانانــە، چــۆتە نێــو ئــەو پرۆســەیەوە و، ئــەو ئاستەنگانەی هاتوونە بەردەمی، لێنەگەڕاوە وای لیّ بكەن ئـەو ئامانجەیەی هەیەتی، ئەویش ئەوەیە ئەو سوڵحە بە كۆتا بگـا و بگەنە سوڵح و ڕێككەوتن، نەیهێشتوە پەكی بخرێت.

٢- بەرزكردنەوەی مەعنەوییات:

أ- (وعنْ أبي عبداللَّهِ خَبَّابِ بْنِ الأَرتِّ رضي اللّه عنه قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رسولِ اللَّهِ وَهُو مُتَوسِّدٌ بُردةً لَهُ في ظلِّ الْكَعْبة، فَقُلْنَا: أَلا تَسْتَنْصرُ لَنَا أَلا تَدْعُو لَنَا؟ فَقَالَ :قَد كَانَ مَنْ قَبْلكُمْ يؤْخَذُ الرَّجُلُ فيُحْفَرُ لَهُ في الأَرْضِ فيجْعلُ فِيهَا، ثمَّ يُؤْتى بالْمِنْشارِ فَيُوضَعُ علَى رَأْسِهِ فيُجعلُ نصْفَيْن، ويُمْشطُ بأَمْشاطِ الْحديدِ مَا دُونَ لَحْمِهِ وَعظْمِهِ، مَا يَصُدُّهُ ذلكَ عَنْ دِينِهِ، واللَّهِ ليتِمنَّ اللَّهُ هَذا الأَمْر حتَّى يسِير الرَّاكِبُ مِنْ صنْعاءَ إِلَى حَضْرمْوتَ لاَ يخافُ إِلاَّ اللَّهَ والذِّئْبَ عَلَى غنَمِهِ، ولكِنَّكُمْ تَسْتَعْجِلُونَ)[1].

---

١) البخاري: ٣٦١٢.

خەبابی کوڕی ئەرەت دەڵێ: کە سکالآمان بردە لای پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەبەر سێبەری کەعبە پاڵکەوتبوو و پاڵی بە پۆشاکێکی خۆی دابوو گوتمان: ئایا داوای سەرکەوتنمان بۆ ناکەی؟ ئایا دوعامان بۆ ناکەی؟ پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: لە پێش ئێوەدا خەڵك هەبوو چاڵیان بۆ هەڵدەکەند و بە مشار شەقیان دەکرد و، بەشانەش گۆشت و ئێسقانیان لێك جیا دەکردەوە و، هەڵنەدەگەڕایەوە، بەخوا! خوا ئەم ئایینە تەواو دەکات، هەتا سوارێك لە صەنعائەوە دەچێتە حەزرەمووت و، جگە لە خواش ترسی لە کەس نابێ و، مەترسیی گورگیش بۆ مەڕەکانی، بەڵام ئێوە پەلە دەکەن.

– (عن البراء بن عازب قال: أمرنا رسول الله - صلى الله عليه وسلم - بحفر الخندق قال: وعرض لنا صخرة في مكان الخندق...)[1]

بەرائی کوڕی عازیب (خوای لێ ڕازی بێ) کە باسی هەڵکەندنی خەندەقی جەنگی ئەحزاب دەکات، دەڵێ: بەردێکمان هاتە پێش، بۆمان نەدەشکێنرا، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلم) دابەزی و قۆڵی هەڵکرد پاچێکی پێبوو لێیدا، سێ جاری لێدا، جارێکیان شەبەقێکی لێ بۆوەو (ألله أكبر)ی کرد، جاری دووەم

١) أحمد: ١٨٦٩٤. و عند البخاري: ٤١٠١.

و جـاری سـێیەم، دوایـی فـەرمووی: لـە شـەبەقی یەكەمـدا قەسرەكانی شام و ڕۆمم لـێ دەركـەوت و، هـی دووەمـیش هـی كیسـڕا و، هـی سێیەمیش هـی حەبەشـە، واتـە ئـەو شـوێنانە هەموویان دەگرن، لە كاتێكدا كە ئابڵووقە دراون.

٣- داهێنان و تازەگەریی:

سەركردە دەبێ داهێنان بكا لە كاتێك كە كێشە دێنە پێش، لەو بارەوە نموونەیەك دەهێنینەوە كە پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دوای ئـەوەی هـەواڵی هـاتنی سـوپای قـوڕەیش لەگـەڵ هاوپەیمانـەكانی دەبیسـتێ كـە بـە دە هـەزار كەسـەوە دێـن و ئابڵووقەی شاری مەدینـە دەدەن، ڕاوێـژ بـە هـاوەڵانی دەكـات چی بكەین؟ سـەلمانی فارسیی دەڵـێ: ئێمـە عادەتمـان وابـوو وەك خـەڵكی فـارس، كـە ئەگـەر دوژمـن بۆمـان بهاتبایـە لـەو شـوێنانەی ڕووتەنـە دەشـت و بـەیارە، ئێمـە خەنـدەقمان لـێ دەدا، ئـەوەبوو پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) پێشـنیارەكەی وەرگرت وەك لە (مسند احمد) و (سيرة ابن هشام)دا[1] هاتوە و خەندەق لێ دەدەن.

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٣، ص١٠٩.

### ٤- دەست و برد کردن لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا و نەوەخراندنیان:

بۆ دەست و برد کردن لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا، دەتوانین نموونە بەوە بێنینەوە کە لە سیرەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هاتوە: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا لە دوای جەنگی حونەین دەبیستێ کە پشتیوانەکان نیگەرانیی و مقۆ مقۆیەکیان لە نێودا بۆ پەیدا بووە، هەموویان لە ژێر چادرێکدا کۆ دەکاتەوە و چەند قسەیەکیان لەگەڵدا دەکات[1]، پێیان دەفەرموێ: گلەییەکەی خۆتان بکەن، ئەوانیش بە ڕوونیی قسەکانی خۆیانی پێ دەڵێن و، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەلامیان دەداتەوە و، دوایی دڵنیایان دەکاتەوە کە ئەو هەر لەگەڵیان دەمێنێتەوە لە شاری مەدینە و، پێشیان دەفەرموێ: ئایا ڕازی نابن خەڵك حوشتر و مەڕ و بزن لەگەڵ خۆی بەرێتەوە، ئێوەش پێغەمبەری خوا لەگەڵ خۆتاندا بەرنەوە بۆ شارەکەتان، ئیتر هەموویان دەگرین و، دواتر ڕازی دەبن، واتە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لێ نەگەڕاوە ئەو مقۆ مقۆیەی کە لە نێوانیاندا پەیدا بووە، گومانەکە زیاتر بترووکێ و گەرای خراپ دابنێت.

---

١) البخاري: ٤٣٣٠ و مسلم: ١٠٦١.

٥- پشت بە خوا بەستن و پاڕانەوە:

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **هەمیشە هەر وابووە و پشتی بە خوا بەستووە و پاڕاوەتەوە، بۆ وێنە: لە جەنگی بەدردا[1] عومەری كوڕی خەتتاب دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)**، دوای ئەوەی دوو سوپایەكە لە ڕاستێكدا ڕاهاتن، دەستی بەرز كردەوە و زۆر بە كوڵ پاڕایەوە، تەنانەت ئەبوو بەكر** (خوای لێ ڕازی بێ) **لە پشتەوە گرتی و لە باوەشی گرت و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! پاڕانەوەكە بەسە، خوای پەروەردگار وەڵامت دەداتەوە.**

٦- وریایی لە كاتی قەیران و كێشەدا.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **هەمیشە هەر وابووە، بۆ نموونە: لەبارەی خۆپاراستنەوە لە نەخۆشیی، فەرموویەتی:** (إذا سَمِعْتُمْ بالطَّاعُونِ بأَرْضٍ فلا تَدْخُلُوها، وإذا وقَعَ بأَرْضٍ وأَنْتُمْ بها، فلا تَخْرُجُوا مِنْها).[2]

**واتە: ئەگەر بیستتان تاعوون لە شارێكە لەسەر زەمینێكە ئێوە مەچوونە نێوی و، ئەگەر تێشیدابوون، لێی مەچوونەدەر.**

---

١) مسلم: ١٧٦٣.

٢) البخاري: ٥٧٢٨.

**٧- خۆڕاگریی و پشوو درێژیی:**

وەك پێغەمبــەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویــەتی: (وَمَنْ يَتَصَــبَّرْ يُصَــبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَـا أُعْطِـيَ أَحَـدٌ عَطَـاءً خَـيْرًا وَأَوْسَـعَ مِـنْ الصَّبْرِ)[١]. واتە: هەر کەسێك خۆڕاگر بـێ، خـوا خـۆڕاگریی پـێ دەبەخشێ و، هیچ بەخششێکتان پێ نەدراوە چاکتر و فـراوانتر لـە خـۆڕاگریی، بێگومـان بـەبێ خـۆڕاگریی و سـینەفراوانیی و نەلەخشان، سەرکردایەتیی ناکرێت.



---

١) البخاري: ٦٤٧٠.

## یەكەم: شوێنەوارەكانی سەركردایەتییكردنی باش لەسەر تاك

شوێنەواری یەكەم: بێگومان گەورەترین شوێنەوار بۆ تاكێك، كە سەركردەیە و سەركردایەتیی دەكات بە شێوەی باش و شەرعییانە، ئەوەیە كە ڕەزامەندیی خوا و پاداشتی خوا بە دەست دەهێنێ، چونكە پێشتر باسمان كرد، كە زانایانی ئیسلام یەكدەنگیبان لەسەر ئەوە هەیە، كە سەرپەرشتییكردنی كاروباری كۆمەڵگا، گەورەترین تاعەتە، گەورەترین تاعەتیش گەورەترین پاداشتی هەیە.

خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (البقرە) ئایەتی (٣٨)دا دەفەرموێ: ﴿فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾﴾البقرة (٣٨) واتە: هەر كەسێك شوێن ڕێنمایی من بكەوێ، نەترسیان لەسەرە و پەژارەداریش نابن.

پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لە ژمارەیەك لە فەرمایشتەكانی دا هۆشداریی داوە بە مسوڵمانان كە ئەگەر كاروبارێكی خەڵك و كۆمەڵگایان كەوتە ئەستۆ، دەبێ زۆر بە دڵسۆزانە و چالاكانە ئەنجامی بدەن، بۆ ئەوەی گەورەترین

پاداشتیان هەبێ، نەك تەنەخیی و تەوەزەلیی تێدا بکەن و سەرەنجام تووشی سزا ببن.

یەکێك لە فەرمایشتەکان پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: (ما مِنْ عبدٍ يسترْعيه اللّهُ رعيَّةً، يموتُ يومَ يموتُ، وهوَ غاشٌّ لرعِيَّتِهِ، إلَّا حرّمَ اللّهُ عليْهِ الجنَّةَ)[1]. واتە: هیچ بەندەیەك نیە، خوا خەڵکێکی بخاتە بەردەست، کاتێك دەمرێ بە شێوەیەك بمرێ، کە خیانەتی کردبێ لە خەڵکەکەی، مەگەر خوا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات، واتە: شایەنی چوونە بەهەشت نابێ، مادام لەگەڵ خەڵکەکەیدا دڵسۆز و ڕاست و ساغ و بە پەرۆش نەبووبێ.

لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: (مَا مِنْ أَمِيرٍ يَلِي أَمْرَ الْمُسْلِمِينَ، ثُمَّ لاَ يَجْهَدُ لَهُمْ، وَيَنْصَحُ، إِلَّا لَمْ يَدْخُلْ مَعَهُمُ الْجَنَّة)[2]. واتە: هیچ سەرکردەیەك نیە کاروباری مسوڵمانان بە ئەستۆوە بگرێ، دوایی بۆیان تێنەکۆشێ و بۆیان دڵسۆز نەبێ، مەگەر لەگەڵیان ناچێتە بەهەشت.

کەواتە: یەکەمین بەرهەم و شوێنەواری سەرکردایەتیی باش، بۆ تاك، ئەو کەسەی دەبێتە بەرپرس و سەرکردە،

---

١) مسلم: ١٤٢.

٢) مسلم: ١٤٢ .

ئەوەیە ئەگەر بەڕاستیی و چاکیی بیکات، خوای بەخشەر لێی ڕازی دەبیٚ و گەورەترین پاداشتی پیٚ دەبڕێت.

شوێنەواری دووەم: بریتیە لەوە کە هاوەڵەکانی و خەڵکەکەی متمانەی پیٚ دەکەن و ڕێزی لیٚ دەگرن، چونکە وەك ئایەتەکە دەفەرمویٚ: ﴿ هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ ﴾الرحمن. واتە: پاداشتی چاکە هەر چاکەیە، لە ڕاستییدا مەگەر چۆن، ئەگەرنا هەستی گشتیی خەڵکی، کەم وایە بە هەڵەدا بچیٚ، هەر کەسیٚ بە دڵسۆزیی کاریان بۆ بکا و خزمەتیان پیٚ بکات، دڵسۆزیی و پەرۆشییەکەی دەبینن و، لە بەرامبەردا ڕێزی دەگرن و، بە قسەی دەکەن و حورمەتی دەزانن.

شوێنەواری سێیەم: شوێنەواری سێیەمی سەرکردایەتیی باش کردن، لەسەر تاك، بریتیە لەوەی کەسی سەرکردە و بەرپرس خۆی بەختەوەر و دڵخۆش و دڵ ئاسوودە دەبێت، خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾یونس. خوای بەبەزەیی بە پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرمویٚ: پێیان بفەرموو، با بە بەخشش و بەزەیی خوا، هەر بەوە زۆر دڵخۆش بن، ئا ئەوە باشترە لەوەی کۆی دەکەنەوە.

کەواتە: کاتێك کەسێك بەرپرسە و هەست دەکا کە کارەکەی خۆی بە چاکیی ئەنجام داوە و، دڵسۆزانە چاودێریی

خوا بەسەر خۆیەوە بینیوە و، زانیویەتی ئەو کارەی هاتۆتە دەستی، سپاردەیە بە ئەستۆیەوەو، بەو چاوە تەماشای کردوە، بێگومان هەست بە شادمانیی و بەختەوەریی دەکات، وێڕای ئەوەی خوای پەروەردگاریش لێی ڕازی دەبێ و پاداشتی دەداتەوە.

با نموونەیەکی بچووك بهێنینەوە لە سیرەی عومەری کوڕی خەتتاب دا، (خوای لێ ڕازی بێ)، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس نامەیەك دەنووسێ بۆ عومەری کوڕی خەتتاب، لە نامەکەدا ئەمە هاتوە: (واللّه إن الجيش لذو أمانة و لو لا ما سبق لأهل بدر لقلت: وأيم اللّه على فضل أهل بدر، لقد تتبعت من أقوام منهم هنات و هنات فيما أحرزوا، ما أحسبها و لا أسمعها من هؤلاء القوم)[1]. سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس کە فەرماندەی سوپای مسوڵمانان بووە کە بەرەو فارس چوون لە ڕۆژگاری عومەری کوڕی خەتتابدا، نامەیەك دەنووسێ و دەڵێ: سوێند بەخوا ئەم سوپایە زۆر دەستپاکن، ئەگەر لە بەر ئەوە نەبووایە کە خوا موژدەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەری بە خەڵکی بەدر داوە، سوێند بەخوا دەمگوت: ئەمانەش هاو ئاستی ئەوانەن، کە لە جەنگی بەدردا بەشدارییان کردوە، دوایی دەڵێ: چونکە ئەوانەی لە جەنگی بەدر بەشدار بوون، هەندێك

١) تاريخ الطبري ج٤، ص١٩.

کەم و کورپییم دەبینین، لەوەی کە بەدەستیان هێنابوو لە دەستکەوتی جەنگی، بەڵام پێم وانیە و نەشمبیستوە، ئەوانەی لەم جەنگەدا بەشدار بوون ئەو شتانە لێی ڕوودابن و زۆر ئەهلی ئەمانەت بوون، سەعد زۆر دڵخۆش بووە کە سوپایەک وابووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە سەعد (خوای لێ ڕازی بێ) خۆشی هەروا بووە و، لە سەرووی خۆشییەوە، کە عومەری کوڕی خەتتاب بوو (خوای لێ ڕازی بێ)، هەر وابووە، وەك یەكێك لە وەسفی عومەردا گوتوویەتی: تۆ ئەمینی بۆیە سوپایەکەشت ئەمینە و، ئەگەر تۆ وەنێو کەوتبای ئەوانیش وەنێو دەکەوتن.

## دووەم: شوێنەوارەکانی حوکمڕانیی باش لەسەر کۆمەڵگا

١- بێگومان یەکەمین شوێنەواری باشی سەرکردایەتییکردنی باش لەسەر کۆمەڵ و لەسەر کۆمەڵگا و لەسەر دەوڵەت، ئەوەیە کە ئەو سەرکردەیە دڵسۆزە بۆ خەڵکەکە و، بە تەنگییانەوەیە و دەیەوێ چاکیان بکا و پاکیان بکا و پەروەردەیان بکات.

٢- دووەمین شوێنەواریش ئەوەیە تەبایی و یەکڕیزیی ئەو خەڵك و کۆمەڵگایە دەپارێزێ.

٣- سێیەمین شوێنەوار ئەوەیە، كە هەوڵ دەدات هەموو وزە و تواناكانی ئەو خەڵك و كۆمەڵگایە بەهرەمەند بێ هەر كامێكیان لە شوێنی خۆیدا كە، بۆ وێنە: پێغەمبەری كۆتایی (محمد) (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، ئەبوو سوفیان، كە تازە مسوڵمان بووە لە وزەی ئەویش بەهرەمەند بووە، دوای ئەوەی عەبباسی مامی لە ئازاد كردنی مەككەدا دەڵێتە پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): ئەبوو سوفیان پیاوێكە پێی خۆشە بەرپرسیارییەتی هەبێ و ناوێكی هەبێ، پێغەمبەریش (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: (من دخل دار أبي سفيان فهو آمن).[1] واتە: هەركەسێك بچێتە ماڵی ئەبوو سوفیانەوە، لە خۆی دڵنیایە، هەڵبەتە ئەو بەرپرسیاریەتییەش هیچ نەبووە، گرنگ ئەوەیە ئەبوو سوفیانی ڕازی كردوەو، ئەویش پشكێكی پێ بڕاوە، پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕەچاوی ئەوەی كردوە كە ئاگای لە دڵی هەموو لایەك بێت.

٤- كاتێك بەرپرس بزانێ خەریكە هەڵەیەك، كەموكوڕییەك، لادانێك پەیدا دەبێت، دەبێ وریا بێ و زوو فریای بكەوێ، لەو بارەوە لێرەدا نموونەیەك دەهێنینەوە: (فقال سعد بن عبادة: يا أبا سفيان! اليوم يوم الملحمة، اليوم تستحل

---

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٤، ص٢٢٨.

الحرمة –الكعبة). سەعدی کوڕی عوبادە سەرۆکی هۆزی خەزرەج لە فەتحی مەککەدا دەڵێ: ئەی ئەبوو سوفیان! ئەمڕۆ ڕۆژی جەنگە و، ئەمڕۆ حورمەتی کەعبە دەشکێندرێ، پێغەمبەریش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کە پێی دەگاتەوە، یەکسەر بەرپەرچی سەعد دەداتەوە: (فقال النبي: بل هذا يوم تُعَظَّم فيه الكعبة، و أمر بالراية أن تؤخذ من سعد بن عبادة ويقال أنها دفعت إلى ابنه قيس بن سعد)[1]. پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لەسەر ئەوەدا باز نادات، چونکە ئەوە کاتی جەنگەو، ئەگەر سەعد کە سەرۆکی هۆزی خەزرەجە، ئەوە بیرکردنەوەی بێ، کە ئەمڕۆ ڕۆژی تۆڵە سەندنەوەیەو، ڕۆژی شکاندنی حورمەتی کەعبەیە، پێشینان گوتەنی: {گەورە دەڵێ: لە بنە بانان و گچکە دەڵێ: لەسەر بانان}، {گەورە ئاوێ دەڕێژێ و، گچکەش پێی لێ دەخات}، هەر بۆیەش پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گەرما و گەرم، سەعدی کوڕی عوبادە، کە سەرۆکی بەشێك لە سوپایەکە بووە، یەکسەر ئاڵایەکەی لێ وەردەگرێ، بەڵام بۆ ئەوەی زۆریش دڵی نەشکێت، ئاڵایەکە تەسلیمی کوڕەکە دەکات، قەیسی کوڕی سەعد، بەڵام با بزانرێ: ئەوە

---

١) البداية و النهاية ج٤، ص ٣٣٧.

هەڵوێستێكی هەڵە بووە، كە سەعدی كوڕی عوبادە نواندوویەتی، بۆ ئەوەی سەربازەكانیشی بەو هەڵە و كەموكوڕییە بزانن و، لەوەدا چاوی لێ نەكەن.

٥- هەروەها سەركردە و بەرپرس دەبێ دین و ژینی كۆمەڵگا بپارێزێ، لێرە با ئاماژە بكەین بە هەندێك هەڵوێست ئەبوو بەكر (خوای لێ ڕازی بێ): ئەبوو بەكر (خوای لێ ڕازی بێ) كە بوو بە جێنیشینی یەكەمی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كاتێك دەستی كرد بە حوكمڕانیی، ئاشكرایە كە شەڕەكانی هەڵگەڕانەوە(ردة) ڕوویان دا و، بیانوویان بەوە گرتبوو زەكات نادەن، مێژوونووسان زۆر قسەیان لەوبارەوە كردوە، كە بەشێكیان هەر بڕوایان بە ئیسلامیش نەمابۆوە و هەڵگەڕابوونەوە، بەشێكیشیان گوتوویانە: زەكات نادەین، ئنجا ئەگەر بڕواشیان بە زەكات نەبێت، كە لەو هەموو ئایەتانەدا هاتوە، پێی كافر دەبن، بەشێكیش دەڵێن: بڕوایان پێی هەبووە، بەڵام گوتوویانە: زەكات نادەین، گرنگ ئەوەیە ئەبوو بەكر (خوای لێ ڕازی بێ) زۆر بە عەزم و جەزم گوتی: (واللَّهِ لو مَنَعُونِي عَنَاقًا كانوا يُؤَدُّونها إلى رسولِ اللَّه صلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ لَقَاتَلْتُهم على دَفعِها)(١). واتە: سوێند بە خوا

---

١) البخاري: ١٤٥٦، ١٤٥٧.

ئەگەر كاریلەیەك كاتی خۆی دابیان بە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) وەك زەكات، من لە دژیان دەجەنگم تاكو ئەو كاریلەیەش دەدەن، واتە لە كەم و زۆری زەكات خۆش نابم، كە نەیدەن، لەبەرچی؟ چونكە زەكات مافی خەڵكی هەژار و نەدارە لە پارە و سەروەت و سامانی دەوڵەمەندەكان.

ئەبوو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتوویەتی: (لولا أبو بكر لهلكت أمة محمد بعد نبيِّها)[1]. واتە: ئەگەر ئەبوو بەكر نەبووایە، ئۆممەتی موحەممەد لە دوای پێغەمبەرەكەی دەفەوتا، چونكە ئەبوو بەكر (خوای لێ ڕازی بێ) زۆر پابەند بوو بە ڕێباز و ڕێوشوێنی پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام)، یەكێك لەوانەی كە ڕەخنەی لە هەڵوێستەكەی هەبوو عومەری كوڕی خەتتاب بوو (خوای لێ ڕازی بێ)، گوتی: چۆن شەڕ لەگەڵ كەسانێكدا دەكەی كە شایەتمان دەهێنن بە خوا و بە پێغەمبەری خوا؟ ئەبوو بەكر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر دەفەرموێ: (إلا بحقها)، نوێژ لە هەقی شایەتمانە و، نوێژ و زەكاتیش خوا پێكەوە باسی كردوون، لەبەر ئەوە هەر كەسێك زەكات نەدات، شایەتمانەكەشی بەڕاستیی نیە، دوایی عومەریش

---

١) الروض الأنف، ج٧، ص ٣٩٦.

هاتە سەر ڕای ئەو و یەکدەنگیی هاوەڵان دروست بوو لەسەر ئەوە، کە دەبێ بە هێز و چەك بەرامبەر هەڵگەڕاوان و زەکات نەدەراندا، بووەستن.

ئەبوو بەکر (خوای لێ ڕازی بێ) ئاوا بووە دین و ژینی کۆمەڵگا و خەڵکەکەی خۆی و ئۆممەتی موحەممەدی لە ڕۆژگاری خۆیدا پارستوە، بۆیەش زۆر بە گرنگیی و بایەخەوە تەماشای سەرکردەکانی کردوە: (أن امرأة سألت أبا بكر الصديق رضي الله عنه قائلة: ما بقاؤنا على هذا الأمر الصالح الذي جاء الله به بعد الجاهلية؟ فردَّ قائلاً: بقاؤكم عليه ما استقامت لكم أئمتكم)[1]. واتە: ئافرەتێك پرسیاری لە ئەبوو بەکری صیدیق کرد (خوای لێ ڕازی بێ) پێیگوت: ئەم کارە چاکەی کە لە دوای سەردەمی نەفامییدا خوا بۆی هێناوینە پێش، چەندە لەسەری دەمێنینەوە؟ ئەبوو بەکر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەوەندە لەسەری دەمێننەوە، تاکو سەرکردە و پێشەوایەکانتان ڕاست بن لەسەر ئەو ڕاستە شەقامە، خەڵکەکەش بە گشتیی لەسەری دەمێنێتەوە، وەك گوتراوە: (الناس على دين ملوكهم)، خەڵك لەسەر ئایین و پەیڕەوی حوکمڕانەکانی خۆیانن، ئەمەش تاکو ڕاددەیەکی زۆر ڕاستە.

---

١) البخاري: ٣٨٣٤.

بەڕێزان !

ئایا چۆن پێشبینیی ئەوە بكەین، كە كێ بە كەڵكی سەركردایەتیی دێت و، كێ بە كەڵك نایەت، كێ چی لە توانادا هەیە ؟

چەند نیشانەیەك هەن كە پسپۆڕانی ئەو بوارە وەك مەرج خستوویاننە ڕوو:

**١- جیددیی بوون لە ئیش و كاردا و دەستپێشخەربوون:**

كەسێك كارێكی پێ دەسپێردرێ، دەبێ بە جیددیی ئەنجامی بدا و دەستپێشخەریی لە ئەنجامدانی كارەكەیدا بكات، واتە چاوەڕێ نەكات بزانێ خەڵكی دیكە چی دەكات ! بەڵكو خۆی دەستپێشخەریی و داهێنان بكات.

لێرە دەتوانین ئاماژە بەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بكەین: ڕۆژێك ئەم فەرمایشتەی بۆ هاوەڵانی فەرموو، فەرمووی: پێشانیان دام گوتیان: (هذه أمتك معهم سبعون الفاً یدخلون الجنة بغیر حساب و لا عذاب، فقال عكاشة: یا رسول الله ادع الله لي أن یجعلني منهم)[1].

---

١) البخاري و مسلم: ٢٢٠ و اللفظ له.

واته: ئەوە ئوممەتەکەی تۆیە حەفتا هەزاریان لەگەڵدایە، بێ لێپرسینەوە و بە بێ سزادان دەچنە بەهەشت، عوکاشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دوعا بکە یەکێك لەوان بم، پێغەمبەری خواش (علیه الصلاة والسلام) دوعای بۆ کرد، یەکێکی دیکە دوای عوکاشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! دوعام بۆ بکە منیش لەوان بم، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: (سبقك بها عكاشة) واتە: عوکاشە پێش تۆ کەوتەوە، نەیویست دڵی بشکێنێ، بەڵام دیارە شایستە نەبووە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) بۆ ئەویش داوای دەکرد: کەواتە دەستپێشخەریی کردن و چوونە پێش، یەکێکە لەو سیفەتانەی کە مرۆڤ وا لێ دەکات، شایستەی کار پێ سپێردران و سەرکردایەتیی بێت.

## ٢- بوێریی و ئازایەتیی لە هەڵوێستان دا:

لە شێنەیی دا هەموو کەس ئازایە، بەڵام کە قەیرانێك کێشەیەك، ترسێك و نارەحەتییەك دێتە پێش، لەوێدا دەبێ مرۆڤ ئازا و بوێر بێ و ئەژنۆی نەلەرزێ، دەتوانین لێرەدا ئاماژە بکەین بەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام): (عن أنس أن رسول الله أخذ سيفاً يوم أحد فقال: من يأخذ هذا

منّي...؟!)[١] واتە: پێغەمبەر لە جەنگی ئوحددا شمشێرێکی بەدەستەوە گرت فەرمووی: کێ ئەم شمشێرەم لێ وەردەگرێ، ئەنەس گوتی: ژمارەیەك لە هاوەڵان دەستیان بەرز کردەوە و ئاماژەیان بۆ کرد کە ئامادەن، دوایی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) فەرمووی: کێ ئەم شمشێرەم لێ وەردەگرێ هەقی خۆی بداتێ، دەڵێ: ئەوجار خەڵکەکە تۆزێك کشانەوە، بەلام لەو حاڵەتەدا ئەبوو دوجانە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من وەری دەگرم و هەقی خۆیشی پێ دەدەم، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شمسێرەکەی دا بە ئەو، دوایی یەکێك لە هاوەلان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەبوو دوجانەم بینی خۆی بەسەر پێغەمبەری خوادا نووشتان بۆوە، تیری بۆ دەهات، شیری بۆ دەهات، ئەبوو دوجانە دەیگوت: (نَحْرِي دُونَ نَحْرِكَ) واتە: سینگم لە پێش سینگتەوەیە، خۆی بەسەر پێغەمبەردا نووشتاندبۆوە بۆ ئەوەی هەرچی شتە بەو بکەوێ و پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سەلامەت بێ، دیارە بە شمشێرەکەشی ئەوەندەی توانیویەتی بەرگریی پێکردوە.

هەروەها ئاماژە بکەین بە هەڵوێستێکی (عبدالله)ی کوڕی (**زبیر**) (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ[٢]: کۆمەڵێك منداڵ یاریی

---

١) مسلم: ٢٤٧٠.

٢) الكامل في التأريخ، ج ٣، ص ٤٠٧.

و گەمەیان دەكرد، هەشت نۆ دە ساڵان بوون، لە نێویشیاندا (عبداللە)ی كوڕی زوبێریش هەبووە، عومەری كوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ)، لەگەڵ كۆمەڵێك لەوانەی كە لە خزمەتی دابوون بە ڕێیەكدا دەڕۆن، هەموو منداڵەكان ڕادەكەن و بڵاو دەبن، (عبداللە)ی كوڕی زوبێر لە شوێنی خۆی دەبێ، عومەری كوڕی خەتتاب بانگی دەكا و دەڵێ: ئەوە بۆچی هاوڕێیەكانت ڕایان كرد و تۆ ڕات نەكرد؟ دەڵێ: ئەی سەركردەی بڕواداران! ڕێیەكە تەسك نەبوو بۆت چۆڵ بكەم و هیچ شتێكی خراپیشم نەكردبوو لە سزاكەی بترسم. مانای وایە (عبداللە)ی كوڕی زوبێر، كە دواتر لە سەردەمی بەنی ئومەییەدا دەبێتە حوكمڕانی گشتیی مسوڵمانان و، دەبێتە خەلیفەی مسوڵمانان، هەر لەو تەمەنی منداڵییەوە لیاقەت و شایستەیی و ئەو سیفەتانەی تێدا هەبوون.

## ٣- زیرەكیی و وردبوونەوە:

واتە: زیرەكییەكی لەسەرووی ئاستی نێوەڕاست بەسەرەوە، دەتوانین نموونە بەوە بێنینەوە كە ڕۆژێك پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: (إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لا يَسْقُطُ ورَقُها، وإنَّها مَثَلُ المُسْلِمِ، فَحَدِّثُونِي ما هي؟ فَوَقَعَ النَّاسُ في شَجَرِ البَوادِي. قالَ عبدُ الله: ووَقَعَ في نَفْسِي أنَّها النَّخْلَةُ، فاسْتَحْيَيْتُ، ثُمَّ قالوا: حَدِّثْنا ما هي؟ يا رَسولَ اللَّهِ، قالَ فقالَ:

هـي النَّخْلَةُ. قالَ: فَذَكَرْتُ ذلكَ لِعُمَرَ، قالَ: لأَنْ تَكُونَ قُلْتَ: هي النَّخْلَةُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِن كَذا وكَذا)[1].

واتە: درەختێك هەیە لە نێو درەختاندا گەڵاكەی ناوەریٚ، وەك مسـولْمان وایـە {درەختێكی زۆر بـە بەرەكەتـە}، (عبداللە)ی كوڕی عومەر (خوای لیٚ ڕازی بیٚ) دەگێڕێتەوە دەڵـێ: خەڵك كەوتنە نێو دار و درەختان لـە بەنـدەن و چیا و چۆلان {فلاٚنە درەختـە و فلاٚن درەختـە هـەر فـەرمووی: هـەو نـین}، دەڵێ: منیش بە دڵم دا هات كـە ئـەوە درەختی دار خورمایـە، بەلاٚم گچكە بووم شەرمم كـرد بیڵـێم، دەڵـێ: دوایـی پێغەمبـەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فـەرمووی: ئـەوە دار خورمایـە، دەڵـێ: بـۆ عومەری كوڕی خەتتابم گێڕایـەوە، گـوتی: ئەگـەر تـۆ گوتباتـە ئەوە دارخومایە، پێم خۆشتر بوو لە فلاٚنە شت و فلاٚنە شت.

## ٥- هیممەت بەرزیی:

سـیفەتێكی دی كـە نیشـانەیە بـۆ ئـەو جـۆرە كەسـەی، بـە كـەڵكی سـەركردایەتیی دێـت، بریتیـە لـە هیممـەت بـەرزیی، هەندێك كەس بە دوای شتی بچووكدا دەگـەڕیٚ، مـرۆڤم بینیـوە بەس بـە دوای كۆكردنـەوەی شوشـەواتدا دەگـەڕیٚ، جارێكیـان سەردانی كەسێكم كـرد، ژوورێكـی ماڵەكـەی هـەمووی پاكـەتی

---

١) البخاري: ٦٢.

جگـەرە بـوو، گـوتم: ئـەوە چـییە؟ گـوتی: هیوایـەتم ئەوەیـە پاكەتان كۆبكەمەوە! سەردانی یەكێكی دیكەم كرد ژوورەكەی هەمووی شخارتە بوو، جۆرەها شخارتەی كۆن هـی سـەردەمی نووری سەعید و كێ و كێی كۆكردبوونەوە! هی وا هەیـە پـوول كۆدەكاتەوە، ئەو پوولانەی كە بەنامـە فەرمییانـەوە دەنـێن، ئەمانە هەموویان هیوایەت و ئاواتی بچووك بچووكن، مرۆڤ دەبێ هیممەتی بەرز بێ، پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفـەرموێ: (إِنَّ اللَّهَ كَرِيمٌ يُحِبُّ الْكَرَمَ، ، و يُحِبُّ معالِيَ الأَخلاقِ، و يكرَهُ سَفْسافَها)[1]. واتـە: خـوا بەخشـندەیە و بەخشـندەیی خـۆش دەوێ و، حەز لە ڕەوشتە بەرزەكان دەكات و، ڕقی لە ڕەوشتە نزمەكانە و، حەزیان لێ ناكات.

مەبەسـتم ئەوەیـە كـە بـۆ كەسـێك بـزانین ئایـا شایسـتەیی ئەوەی هەیە ئەركی بەرپرسیارییەتیی وە ئەستۆ بگـرێ، دەبـێ تەماشای ئەو سیفەتانە و كۆمەڵێ سیفەتی دیكەشی بكرێ.

---

١) الطبراني في الكبير: ٥٩٢٨ و صححه الألباني.

ڕێزان !

هەركات بویستریٚ كەسێك ئامادە بكریٚ بۆ سەركردایەتیی، پێویستە ئەو پێنج بنەمایە لەبەرچاو بگیرێن، واتە لەسەر بناغەی ئەو پێنج بنەمایە ئامادە بكریٚ:

## یەكەم : ئامادەكردنی دەروونیی و ڕووحیی

١- ئیمان:

ئامادەكردنی دەروونیی و ڕووحیی، پێش هەموو شتێك بە ئیمان دەكریٚت، بێگومان ئیمان سەرچاوەی هەموو سیفەتە بەرز و پەسندەكانە، خوای زانا لە بارەی بەنوو ئیسرائیلەوە دەفەرمویٚ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾﴾ السجدة (٢٤). واتە: ئێمە پێشەوایانێكمان تێدا گێڕان، بە فەرمانی ئێمە خەڵكیان ڕێنمایی دەكرد بە هۆی ئەوەوە، كە خۆڕاگر بوون و دڵنیا بوون لە ئایەتەكانی ئێمە {بڕوای تەواویان بە ئایەتەكانی ئێمە هەبوو}.

بێگومان ئەگەر مرۆڤ ئیمانێكی باش و دامەزراوی هەبیٚ، ئەوكاتە ئیمان سەرچاوەی هەموو خەسڵەت و سیفەتە بەرز و

پەسندەکانە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ﴿٤﴾﴾. المؤمنون.

٢- ڕووح و دەروون ساغبوون:

دووەمین ئامادەکردنی دەروونیی و ڕووحیی، ئەوەیە کە هەوڵبدرێ ئەو مرۆڤە ڕووح و دەروونی ساغ بێ، زانایانی دەروونناس لە بارەی تەندروستیی دەروونییەوە، زۆر قسەیان کردوە، یەکێکیان دەڵێ: تەندروستیی دەروونیی ئەوەیە کە ئەو مرۆڤە لەگەڵ خۆی و دەوروبەر و ژینگەدا تەبا بێ و، هەست بە بەختەوەریی بکات، لە مامەڵە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا و، توانای ئەوەی هەبێت کە تواناکانی خۆی لە خۆیدا بەرجەستە بکات[1].

هۆکارەکانی ساغبوونی ڕووح و دەروون:

أ- ئیمان بە خوا.

ب- گەشبینیی و دووریی لە نائومێدیی.

ج- خۆ قبوولکردن و گونجان لەگەڵ خەڵك دا.

د- دڵنیابوون لە توانای بەرەنگاریی گرفت و کێشەکان.

هـ- دەمارگیر نەبوون بۆ بیروڕایەکان.

---

١) الصحة النفسية والعلاج النفسي، د. حامد عبدالسلام زهران،ط ٢٠٠٥م

٣- خەسڵەتە دەروونییە پێویستەكان كە دەبێ كەسی سەركردە لەسەریان پەروەردەبێ:

## أ- ئازایەتیی و بوێریی:

وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ڕۆژێك عەشیرەتێك هاتن بۆلای گوتیان: فلاَن كەسمان كردوەتە فەرماندە، بەلاَم دوو سیفەتی تێدان یەكەم: چرووكە، دووەم: ترسنۆكە، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرمووی: (شر ما في الرّجل شح هالع وجبن خالع)[1]. واتە: پیاوێك خراپتر كە دوو سیفەتی تێدا هەبن، ئەوەیە كە چرووك بێ، چرووكییەك كە دڵی لەگەڵ دینارێك بێتەدەرێ و، ترسنۆكییەكی واش هەموو جارێك ڕابچەنێ.

## ب- سووربوون و نەپسان:

سوور بوون لەسەر كار و كول نەبوون و كۆڵ نەدان، سیفەتێكی یەكجار گەورە و گرنگی سەركردایەتییكردنە، خوای بەرزی مەزن لە چەند شوێنێكی قورئان دا، ستایشی خۆڕاگران و ڕاوەستاو و دامەزراوانی كردوە بۆ وێنە: ﴿٢٩ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ٣٠ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ

---

١) أبوداود: ٢٥١١ و صححه شعيب الأرناؤوط.

فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾﴾ فصلت.

**ئنجا لەو بارەوە وەك نموونەیەك ئاماژە دەكەین بە هەلۆیستێكی (أبو بكرالصدیق)** (خوای لێ ڕازی بێ): (عن أبي هريرة قال: لمَّا توفيِّ رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ، واستخلفَ أبو بكرٍ بعدَه، كفرَ من كفرَ منَ العربِ، فقالَ عمرُ بنُ الخطَّابِ لأبي بكرٍ: كيفَ تقاتلُ النَّاسَ، وقد قالَ رسولُ اللهِ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ: ((أمرتُ أن أقاتلَ النَّاسَ حتَّى يَشهَدوا لا إلَه إلَّا اللهُ، فَمن قالَها، فقد عصمَ منِّي مالَه ونفسَه إلَّا بحقِّه، وحسابُه علَى اللهِ))؟ قالَ أبو بَكرٍ: واللَّهِ لأقاتلنَّ من فرَّقَ بينَ الصَّلاةِ و الزَّكاةِ، فإنَّ الزَّكاةَ حقُّ المالِ، واللَّهِ لَو منعوني عناقًا كانوا يؤدُّونَها إلى رسولِ اللهِ، لقاتلتُهم علَى منعِها، قالَ عمرُ: فواللَّهِ ما هوَ إلَّا أن قد شرحَ اللَّهَ صدرَ أبي بَكرٍ، فعرفتُ أنَّهُ الحقُّ)[1].

**واتە: كاتێك پێغەمبەری خوا** (صلى الله عليه وسلم) **كۆچی دوایی كرد و، ئەبووبەكر لەشوێنی بوو بە جێنشین و، ئەوەی لە عەرەب كافر بۆوە كافر بۆوە، عومەری كوڕی خەتتاب بە ئەبووبەكری گوت: چۆن دژی خەڵك-ی زەكات نەدەر-**

١) البخاري: ٦٩٢٤، ومسلم: ٢٠، البداية والنهاية (٣١٥/٦).

دەجەنگی، لە حاڵێك دا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (فەرمانم پێكراوە كە دژی خەڵك-ی نامسوڵمان- بجەنگم تاكو شایەدیی دەدەن كە جگە لەخوا هیچ پەرستراوێك نیە، ئنجا هەر كەس گوتی، ئەوە سامان و نەفسی خۆی لەمن پاراستوە، مەگەر بە هەقی خۆی، لێپرسینەوەشی لەسەر خوایە).

ئەبووبەكریش گوتی: بەخوا ! دژی كەسێك دەجەنگم كە نوێژ و زەكاتی لە یەك جیاكردوونەوە، چونكە زەكات مافی ماڵ و سامانە، بەخوا گەر كاریلەیەك كە كاتی خۆی داویانە بە پێغەمبەری خوا(صلی الله علیه وسلم) -وەك زەكات- نەمدەنێ، لەسەر نەدانی دژیان دەجەنگم. عومەر گوتی: كاتێك دیتم خوا سینەی ئەبووبەكری بۆ گوشاد كردووە، زانیم كە ئەوە هەقە.

ج- توانای ناسینی كەم و كوڕیی خۆ:

مرۆڤ دەبێ توانای خۆی و كەم و كوڕییەكانی و، خاڵە بێ هێزەكانی خۆی بناسێ، لێرەدا ئاماژە دەكەین بە قسەیەكی ئیاسی كوڕی موعاویە: {عن إیاس بن معاویة قال: (إن من لا یعرف عیبه أحمق، قالوا : یا أبا واثلة ما عیبك ؟ قال : كثرة الكلام)[1] }.

---

١) الطبقات الكبری لإبن سعد، ج٧، ص٢٣٤.

واتــە: ئیاســي کــوڕی موعاویــە {ناســراو بــووە بــەوەی کــە کابرایەکی زۆر عاقڵمەند بووە}، دەڵــێ: کەسێك عــەیبی خــۆی نەزانێ نەفامە، گوتیان: ئــەی (ئــەبو واثلــة) عــەیبی تــۆ چییە؟ گوتی: زۆر قسە دەکەم.

عەیب و خاڵە بێ هێزەکەی خۆی زانیی.

د- ئارامیی و خۆڕاگریی لە سەختییان دا:

ئەمیش سیفەتێکی دیکەی دەروونیی زۆر گرنگ و گەورەیە، بــۆ هــەر کەســێك بیــەوێ بــە کــەڵکی ســەرکردایەتییکردن و پێشــەوایەتیی بــێ و، لــەوبارەوەش ئــەم دێــڕە شــیعرەی (أبــو القاسم الشابِّي) زۆر جوانە کە دەڵێ:

إِذَا مَـا طَمَحْــتُ إِلَــى غَــايَةٍ
رَكِبْتُ الْمُنَى وَنَسِيتُ الحَذَر
وَمَنْ لا يُحِبّ صُعُودَ الجِبَـالِ
يَعِشْ أَبَدَ الدَّهْرِ بَيْنَ الحُفَـر

ئەگەر ویستم بەرەو ئامانجێك بڕۆم، سواری ئاوات و هیوایان دەبم و واز لە وریایی دێنم، هەرکەسێك حەز نەکات بچێتە ســەر چیا بــەرزەکان، هەمیشــە هــەر لــە چاڵ و شــوێنە نزمــەکان دا دەمێنێتەوە.

## دووەم: ئامادەکردنی فیکریی و زانستیی

بێگومان پێش هەموو شتێك، کەسی سەرکردە دەبێ لە ڕووی ڕووحیی و دەروونییەوە بەو شێوەیەی کە باسمان کرد، ئامادەبکرێ و پەروەردە بکرێ و بەهێز بێ، پاشان لە ڕووی فیکریی و زانستییەوە، لە ڕووی فیکریی و زانستییەوە، پێش هەموو شتێك سەرکردەیەکی مسوڵمان دەبێ، لە ئایین و بەرنامەکەی خۆی شارەزا بێ و، بەرچاو ڕوون بێ، ئایین و بەرنامەکەی خۆی پێش هەمووشتێ قورئانە، دوایی ڕێبازی پێغەمبەرە (علیه الصلاة والسلام) ئنجا ئەو حوکمە شەرعییانەی کە لە قورئان و سوننەت هەڵدەهێنجرێن، یان هەڵێنجراون، کە زانایان و پێشەوایان هەڵیانهێنجاون و، ئەو ڕاستییانەی کە لێیان وەردەگیرێن.

دوای ئەوە دەبێ شارەزای واقیعی خۆی بێ و شارەزای تەوژمە فیکریی و سیاسییەکان بێ.

دواییش دەبێ شارەزای مێژوو بێت، چ مێژووی ئیسلام و میللەتەکەی خۆی و کۆمەڵگایەکەی خۆی، کە لە نێویدا دەژی، چ مێژووی ئیسلام بە گشتیی و، چ مێژووی بەشەر، پێویستە کەسێك بە تەمای وەرگرتنی بەرپرسیارییەتی بێ، زۆر شارەزای مێژوو بێت، چونکە مێژوو دەرس و پەندی زۆر تێدان،

وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾. يوسف (١١١)

لە ڕاستییدا ئەوەی گوتراوە مێژوو خۆی دووبارە دەكاتـەوە (التأريخ يعيد نفسه) ڕاستیی زۆری تێدا هەیە، زۆرجار شتێك بۆ ئێستا دێتە پێش، كاتی خۆشی چەند جاری دیكـە هاتۆتـەوە پێش، هەر بۆیە خوای پەروەردگار بەسەرهاتی پێغەمبەرانی بۆ ئێمـە گێڕاوەتـەوە، (سەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ)، لەبـەر ئەوەی یاساكانی خـوا لـە ژیانی بەشـەردا كـارپێكراون، ژیـانی بەشەریش تاڕاددەیەك وێكچوونی تێدایە.

هەروەها لە ڕووی فیكریی و زانستییەوە، دەبێ ئەو كەسەی كـە دەویسـترێ سـەركردەیەكی لـێ بـاربهێنرێ، پێویسـتە شارەزای داهێنان و گۆڕانكارییش بێت، نەك تەنها ئەوەی بووە هەر ئەوە بزانێ، بەڵكو پێویستە بكاتەوە بۆ داهـاتووش و، بـە چـاوێكی داهێنەرانـە و گۆڕانكارییانـە تەماشـای كارەكـان بكات، نەك لـە قـاڵبێكی وشـك بەسـتوودا بمێنێتـەوە، عومـەری كـوڕی خـەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ) كـە پێغەمبـەر (عليه الصلاة والسلام) لە وەسفیدا دەفەرموێ: (فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا يَفْرِي فَرِيَّهُ)[١].

عومـەر كاتێـك حـوكمڕانیی دەوڵـەتی ئیسـلامیی دەكەوێتـە

١) أخرجه البخاري (٣٦٨٢)، ومسلم (٢٣٩٣).

دەست، تەماشا ناكات پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) چی كردوە، كت و مت هەر وەك ئەو بكاتەوە، یان ئەبوو بەكر چی كردوە، كت و مت هەروەك ئەو بكاتەوە، بەڵكو لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەردا (علیه الصلاة والسلام) تەماشای واقیعە تازەكەی خۆی دەكات و، كۆمەڵێك داهێنان دەكات، بۆنموونە: پۆستە دادەنێ، بەندیخانە دادەنێ، دیوانەكان دادەنێ، كۆمەڵێك شتی ئیداریی لە دەوڵەتی فارس و ڕۆم وەردەگرێ، چونكە دەزانێ واقیعەكە پێویستیی بەوە هەیە.

## سێیەم: ئامادەكردنی جەستەیی

پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) لە فەرمایشتێكیدا دەفەرموێ: (الْمُؤْمنُ القَوِيُّ، خَيْرٌ وَأَحَبُّ إلى اللّٰه مِنَ المُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وفي كُلٍّ خَيْرٌ، احْرِصْ علَى ما يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ باللّٰهِ وَلَا تَعْجَزْ، وإنْ أَصَابَكَ شيءٌ، فلا تَقُلْ لو أَنِّي فَعَلْتُ كانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ: قَدَرُ اللّٰهِ وَما شَاءَ فَعَلَ؛ فإنَّ لو تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ.)[1].

١) مسلم: ٥٦٦٤.

واتە: بڕوداری بەهێز لەلای خوا خۆشەویستە و چاکتریشە لە بڕواداری بێ هێز، هەردووکیشیان خێر و بەرژەوەندییان تێدایە {بڕواداره بێ هێزەکەش لە ڕووی جەستەییەوە، ئەویش کەڵێنێکی هەر دەگرێ، دوایی دەفەرموێ:} سووربە لەسەر ئەوەی سوودت پێ دەگەیەنێ و، پشت بە خوا ببەستە و تەمبەڵ و تەوەززەڵ مەبە، ئەگەر بەڵایەکیشت تووش بوو، مەڵێ ئەگەر وا بووایە و وابوویە، واش دەبوو، بەڵکو بڵێ: ئەوە ئەندازەگیریی خوا بوو و، هەرچی خوا بیەوێ ئەوە ئەنجام دەدا، چونکە ئەگەر دەرگا بۆ شەیتان دەکاتەوە {واتە: دەرگا بۆ خوتخوتە و دنە دانی شەیتان دەکاتەوە}.

کەواتە لە ڕووی جەستەییەوە، مسوڵمان دەبێ مشووری خۆی بخوات، ئەویش بە چەند شتێك:

١- خوا پەرستییەکان:

بەو شێوەیەی کە شەریعەت دایناون، لە کاتی خۆیان دا و لە شوێنی خۆیان دا و بەشێوەی خۆیان ئەنجامییان بدات، زەمانەتیی هەر کەسێك دەکەم پێنج نوێژە فەڕزەکان و سوننەتەکان لەگەڵیاندا وەك پێویست جێ بەجێ بکات، بەڵام بەو شێوەیەی کە سوننەتی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ ، زۆر دوور دەبێ لە زۆر کێشە و گرفتی جومگە و بڕبڕەی پشت و گەلێك لە گرفتە جەستەییەکان، هەروەها هەر

كەسێك ڕۆژووە سوننەتەكان بگرێ، بە تایبەتی پێنج شەممە و دووشەممە، هەفتەی دوو ڕۆژ پشوودان بە گەدە و كۆئەندامی هەرسی خۆی بدات، هەروەها هاوسەنگیی بكات لە خواردن و خواردنەوەدا، كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ﴾ الأعراف(٣١). بەتایبەتی لێرەدا دڵسۆزانە بە هەموولایەك دەڵێم: قەڵەویی دیاردەیەكی خراپ و دەردێكی كوشندەی ئەم ڕۆژگارەیە، چونكە قەڵەویی وەك چۆن دیكۆر و ڕواڵەتی مرۆڤ تێكدەدات، لە دیوی نێوەوەش كۆئەندامەكان زۆر زیانبار دەبن، بە هۆی ئەو چەورییەوە كە لەسەر بۆدی و لە دەرەوەی جەستەدا كۆدەبێتەوە، لە ژوورەوەش لەسەر كۆئەندامەكان كۆدەبێتەوە، لەسەر گورچیلە، لەسەر پەنكریاس، لەسەر جگەر و كۆئەندامەكانی دیكە، ئێستا زۆر كەس لە پڕ و لە ناكاو تووشی جەڵتەی دڵ دێ و، تووشی دەمارگیرانی دڵ دێ و، تووشی جەڵتەی مێشك دێ، ئەوانە بەزۆریی دەرهاوێشتەی قەڵەویی و كێشی زیادن.

٢- هاوسەنگی لە خواردن و خواردنەوە و خەودا:

ئەگەر بێت و ئێمە خوا پەرستییەكان چاك ئەنجام بدەین بە فەرز و سوننەتەوە پاشان لە ڕووی خواردن و خواردنەوەوە ئاگامان لە خۆمان بێ و میانگیر بین ﴿وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ وَلَا

تُسۡرِفُوٓاْ﴾، و ئـــەو فەرمایشـــتەی پێغەمبـــەر (علیه الصلاة والسلام) لەبەر چاومان بێ كە دەفەرموێ: (ما ملأ ابن آدم وعاءً شراً من بطن، بحسب امرئ أكلات يقمن صلبه، فإن كان لا محالة فثلث لطعامه وثلث لشرابه وثلث لنفسه)[1]. واتـه: ئادەمزاد هیچ زەرفێكی لە ورگی خراپتری پڕ نـەكردوە {ئەگـەر گـەدەت پڕ بكەی لە خواردن، تۆ خراپتر توورەكە و زەرفت پڕكردوە}، مـرۆڤ چـەند پارووپـەكی بەسـن پشـتی ڕابگـرن، ئەگـەر چـاری نـەبوو، سـێیەكی (گـەدەی) بـۆ خواردنەكـەی و سـێیەكی بـۆ خواردنەوەكەی و، سێیەكی بۆ هەناسەكەی.

٣- پاك و خاوێنیی:

پـاك و خـاوێنیش دیسـان كاریگـەریی زۆری هەیـە لەسـەر ئەوەی مرۆڤ جەستەی بەهێز بێ و، لەش و لارێكی ڕێك و پێكی هەبێ، بۆیـەش كـە پێغەمبـەر (علیه الصلاة والسلام) دەفـەرموێ: (الطهور شطر الإيمان)[2]. واتە: پاك و خاوێنیی نیوەی ئیمانـە، یانی: پاك و خاوێنیی جەستەیی و دەروونیی.

هەروەها پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لـە بـارەی بـەرگ و پۆشـاك و جێگـا و ڕێگـاوە، دەفـەرموێ: (أحسنوا لبَاسَكُمْ

١) مسند إمام أحمد: ١٧١٨٦. وصححه شعيب الأرناؤوط.
٢) مسلم: ٢٢٣.

وأَصْلِحُوا رِحَالَكمْ حَتَّى تَكُونُوا كَأَنَّكُمْ شَامَةٌ فِي النَّاسِ)[١]. واتـه: بەرگ و پۆشاکتان چاك بکەن و، جێگە و ڕێگەتان باش بکـەن، وەك خـاڵ بـن لـه نێـو خەڵکدا، {چـۆن کەسـێك خـاڵێکی بـه شـوێنێکەوەیە، لـه دوورەوە دیـارە، ئێـوەش ئـاوابن لـه نێـو خەڵکدا}.

مسوڵمان نابێ پیس و پۆخڵ و کەمتەرخەم و ئاڵۆز و بڵۆز و قرژن و چڵکن و کوڵکن بێ، بـەڵکو دەبـێ ڕێـك و پێـك و پـاك و خاوێن و بۆن خۆش بێ، تایبەت لە مەسەلەی خـۆ بۆنخـۆش ڕاگـرتن دا، زۆر گرنگـە، هـی وایـە نازانێـت ڕەنگـە نەخۆشـیی شەکرە و زەغت و نەخۆشی دیکەی هەبێ، ئەگەر زۆر ئاگای لە خـۆی نـەبێ بـۆنیکی زۆر ناخۆشـی لـێ دێ، لـە دەم و ددان و پووکی دا، یان هەندێك کـەس کێشـەی هەیـە لـە دەم و ددان و پووکی، دەبێ ئاگای لە خۆی بێ.

پێغەمبەری خوا (عليه الصلاة والسلام) هەموو ئەوانەی لەسـەر ئێمە پێویست کردوە، بۆ وێنـە دەفـەرموێ: (لولا أن أشق على أمتي لأمرتهم بالسواك عند كل وضوء)[٢]. واتە: ئەگەر قورسـم نەکردبایە لەسەر ئۆممەتەکەم، لـەکاتی هـەموو دەسـتنوێژاندا، لەسەرم پێویست دەکردن سیواك بکەن.

١) الحاكم: ٧٣٧١ و صححه الحاكم و وافقه الذهبي.

٢) أخرجه البخاري (٨٨٧)، ومسلم (٢٥٢).

٤- خۆپاراستن لە خواردن و خواردنەوەی پیس:

خـوای پـەروەردگار لـە وەسـفی پێغەمبـەر دا دەفـەرموێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾الأعـراف(١٥٧) واتە: شتە پاك و چاك و سوودبەخشەکانیان بۆ حـەلاڵ دەکـات و، پیس و زیانبەخشەکانیان لێ قەدەغە دەکات.

٥- خۆپاراستن لە تاوان و لادانەکان:

خۆپارستن لە تاوان و لادان و گونـاح ئنجـا لـە مـەیخۆریی و قومار و زینا و کوشتن و دزییەوە بگرە، هـەتا دەگاتـە جگـەرە کێشان و، هەموو ئەو شتانەی حەڕام و پیس و زیانبەخشن.

٦- خۆ چارەسەرکردن لە نەخۆشیی:

پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفـەرموێ: (تداووا عبادالله فإن الله لم يضع داءً الا وضع له دواءً)[1].

واتـە: ئەی بەندەکانی خوا! خۆتـان چارەسـەر بکـەن، خـوا هیچ دەردێکی دانەناوە، مەگەر چارەسەرێکی بۆ داناوە.

## چوارەم: ئامادەکردنی ڕەوشتیی و ئاکاریی

پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خوا بەچی مـەدحی کـردوە؟: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴿٤﴾ ﴾القلــم. ئێمـــە شـــوێنکەوتووی

١) ابن حبان:٦٠٦١ و قال شعيب: صحيح .

پێغەمبەرێکیش خوا بە ڕەوشتی مەزن مەدحی دەکات. پاشان پێغەمبەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئامانجی نێردرانی، خۆی لە تەواوکردنی ڕەوشتی بەرزدا کورت هەڵدێنێ، دەفەرموێ: (بعثت لأتمم حسن الأخلاق)[1]. هەروەها دەفەرموێ: (إنما بعثت لأتمم صالح الأخلاق)[2]. واتە: من ڕەوانە کراوم هەتا ئاکار و ڕەوشتە باشەکان لە خۆمدا بەرجەستە بکەم و تەواویان بکەن.

پێشتریش لە تەوەری چوارەم دا چل (٤٠) ڕەوشت و خەسڵەتی بەرز و ئەرکەکانی سەرکردەی مسوڵمانمان سەرژمێرکردن.

## پێنجەم: ئامادەکردنی کارامەیی و لێزانین و وردەکاریی

پێویستە ئەم جۆرە ئامادەکارییە بکرێ بۆ پێگەیاندنی مرۆڤی سەرکردە، ئەویش بەوە کە پێنج جۆر هونەری فێر بکرێن، کە زۆر بە کورتیی قسەیان لێ دەکەین:

١- هونەری هاندان:

**أ- هاندانی خودیی:** کەسی سەرکردە دەبێ بتوانێ هەم خۆی هان بدات و هەم خەڵك هان بدات، خۆ هاندان

---

١) مالك في الموطأ: ١٨٨٥ و هو صحيح.

٢) مسند الإمام أحمد: ٨٩٥٢ و قال شعيب: صحيح.

ئەوەیە کە خۆت بناسی و تواناکانی خۆت بزانیی و باوەڕ و متمانەت بە خۆت بێ و، بزانی کارت لەبەر دەرواو، کارت لە دەست دێ، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: {ئیش شێرە، ئەگەر خۆت لێ توند کرد، دەبێتە ڕێوی}، هی وا هەیە هەر لە ڕێوە دەڵێ: من هیچم پێ ناکرێ و ئەوەم لە توانادا نیە و، هەر لە ڕێوە بەزیوە، نەخێر دەبێ مرۆڤ باوەڕی بە خۆی بێ و متمانەی بە خۆی بێ و، خۆی لەبەر کارەکە ڕابکات.

**ب- هاندانی دەرەکیی:** ئەگەر تەماشای سیرەی پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بکەین بە زۆر جۆر هانی هاوەڵانی بەڕێزی داوە:

**یەك: بە سەرنجڕاکێشان:** بۆ نموونە: ئافرەتێکی ڕەش هەبووە کە خزمەتی مزگەوتی پێغەمبەری کردوە (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کاتێك دەمرێ، ئاگاداری پێغەمبەر ناکەنەوە و دەینێژن، دوای ئەوەی کە هەواڵەکە دەبیستێ دەفەرموێ: بۆچی ئاگادارتان نەکردمەوە؟! دوایی دەچێتە سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر دەکات[1]. کەواتە بزانن هەر کەسێك خزمەتی مزگەوت بکات، ئنجا ئافرەتە یان پیاوە،

---

١) صحيح مسلم: ٩٥٦ .

یـان هــەر كەسـێكی دیكەیـە، مـادام كـارێكی باشـی كردوە، دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ.

**دوو: بە سۆز و خۆشەویستیی:** بـۆ نموونـە: وتارەكـەی پێغەمبــەر(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دوای دابەشــكردنی دەستكەوتەكانی جەنگی حونەین، بـۆ پشـتیوانەكان، كەپێشتر هێنامان.

**سێ: بە نازناوی باش:** هەروەها پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جاری وا بووە بە نازناوی باش خەڵكی هانداوە وەك خالیدی كوڕی وەلیدی گوتوە: (سـیف الله)(١) واتە: شمشێری خوا.

**چوار: بە پرسیاركردنی فێركەرانە:** بـۆ نموونـە: (أتدرون ما المفلـس؟)(٢) ئایـا دەزانـن موفلیس كێیـە ؟.(أتدرون ما الغيبة؟)(٣) ئایـا دەزانـن غەیبـەت یانی چی؟ بۆ ئەوەی بەرامبەركەی زیاتر بجووڵێنێ.

**پێنج: بە ئیقناعكردنی عەقڵیی:** بۆ نموونە: ئەبوو ئومامە دەگێڕێتەوە: گـەنجێك هاتـە لای پێغەمبـەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) گـوتی: (يا رسولَ اللَّهِ، إئذَنْ لي بالزِّنا)(٤)

---

١) صحيح مسلم: ١٠٦٤.
٢) صحيح مسلم: ٢٥٨١.
٣) صحيح مسلم: ٢٥٨٩.
٤) مسند إمام أحمد: ٢٢٢١١ و قال شعيب صحيح.

ئەی پێغەمبەری خوا! مۆڵەتم بدە زینا بكەم، ئنجا پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نزیكی دەخاتەوە و لێی دەپرسێ: ئایا پێت خۆشە لەگەڵ دایكت، لەگەڵ پوورت، لەگەڵ كێت، لەگەڵ كێت دا، زینا بكرێ؟ گوتی: نەخێر فەرمووی: خەڵكیش دایك و كچ و خوشك و پووری هەیە، پاشان دەستێكی بە سینگی دادەهێنێ و دوعای بۆ دەكات.

٢- هونەری كار پێ سپاردن:

ئەمەش هونەرێكی گرنگە كە پێویستە كەسی سەركردە بیزانێ، كە هەموو كارەكان لە دەستی خۆیدا كورت هەڵنەهێنێ، بەڵكو ئامادەبێ كار بە خەڵك بسپێرێ و بۆ خۆی سەرپەرشتییان بكات، نەك بەڕێوەبەر بێ و هەموو كارەكان بۆ خۆی بكات، ئەوكات هیچ بۆ خەڵك نامێنێتەوە و، بێگومان تووشی ماندوبوون و هەڵەی زۆریش دەبێت، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ئەمەی زۆر بە كار هێناوە بۆ نموونە: لە شەڕی خەندەق دا كارێك بە حوزەیفەی كوڕی یەمان دەسپێرێ، بۆ ئەوەی بزانێ دەنگ و باسی كافرەكان چۆنە[1]، هەروەها

---

١) الروض الأنف، ج٦ ص٢٢١.

موسعەبی كوڕی عومەیر دەنێرێت بۆ ئەوەی خەڵكی یەسریب فێری دینداریی بكات[1]، هەروەها كاتێك لەگەڵ خەڵكی مەككەدا دەگاتە بنبەست، بەسەر عەشیرەتانەوە دەگەڕێ و لە كاتی مەوسیمی حەج دا خۆییان پێ دەناسێنێ و دەفەرموێ: (هل من رجل يحملني إلى قومه، فإن قريشاً قد منعوني أن أُبلِّغ كلام ربيِّ؟)[2]. واتە: ئایا پیاوێك نیە من بباتەوە لای خەڵكەكەی، چونكە قوڕەیش ڕێم لێ دەگرن پەیامی خوا بگەیەنم، واتە: یەكێك هەبێ هاوكارم بێت، دیارە كار سپاردن بەخەڵكی دیكە هەم كات بۆ مرۆڤ دەگێڕێتەوە و، هەم متمانەی ئەوانەی لەگەڵیدان زیاتر دەبێ و، هەم كارەكە داهێنانی زیاتر تێدا دەبێ و، هەم لە ڕووی تێچوون و خەرجییەوە مەسرەف كەمتری تێدایە.

٣- هونەری كاركردنە سەر جەماوەر:

سەركردە دەبێ هەوڵ دات كاریگەریی هەبێ بۆ سەر دەوروبەری و، بۆ سەر خەڵك و جەماوەر، ئەویش بەچەند ڕێگایەك:

أ– باش گوێ بگرێ بۆ هەموو لایەك.

ب– پرسیار كردن لەو كەسەی قسەی لەگەڵ دەكات.

١) صحيح البخاري: ٤٩٤١.

٢) مسند إمام أحمد: ١٥١٩٢ قال شعيب: صحيح على شرط البخاري.

ج- بیروڕا لەگەڵ خەڵکەکەدا بگۆڕێتەوە.

د- گرنگیی بەخەڵك بدات و گوێ بۆ قسەکانیان بگرێ و ڕاوێژیان پێ بکا.

هـ- دیراسەکردنی زمانی جەستە Body Language و شارەزابوونی لە جم و جۆڵەکانی جەستە.

٤- هونەری بەڕێوەبردنی کات:

هەر کەسێك توانی کۆنترۆڵی کات و ئیشەکانی خۆی بکا و لە کاتی خۆی دا ئەنجامیان بدات، دەبێتە سەرکردەیەکی سەرکەوتوو، ئەویش بەم ڕێگایانەی خوارەوە:

أ-سەرکردە بە بێ کۆنترۆڵکردنی کاتی خۆی ناتوانێ گۆڕانکاریی بکات.

- دەبێ ئیشەکانی خۆی بەپێی کاتەکان دابەش کات.

ج- هەر کارەی لە کاتی خۆی ئەنجام بدات.

د- هیچ کارێکی ئێستا نەخاتە کاتێکی دیکە.

هـ- دوورکەوتنەوە لە بە فیڕۆدانی کات و، زوو یەکلایی کردنەوەی کارەکان.

و- ڕیزبەندکردنی کارەکان و تۆمارکردنیان.

٥- هونەری ڕەخنەگرتنی بنیاتنەرانە:

سەركردە وێڕای ئامۆژگاریی كردن و قسەی خۆش بۆ خەڵك كردن، دەبێ توانای ڕەخنەگرتنیشی هەبێ، بەلاَم ڕەخنەگرتنی بنیاتنەرانە، ئەویش ئەوەیە: كەسێك كە ڕەخنەی لێ دەگرێ، سەرەتا خاڵە باشەكانی باس بكات، پاشان بێتە سەر خاڵە نەرێنییەكان و كەم و كوڕییەكانی، ئەوكاتە قسەكانی باشتر لێ وەردەگیرێن.

ئەمانە ئەو بنەمایانە بوون كە پێویستن بۆ ئامادەكردنی كەسێك بۆ سەركردایەتیی، خوا پشتیوان و هاوكارمان بێت بە پێی ئەو بنەمایانە و بنەمایەكانی دیكەش ڕەفتار بكەین، بێگومان مەرج نیە هەر بابەتێك قسەی لێ دەكەم، كۆتا قسە بێ، هەموو ئەو بابەتانە قسە و باسی زیاتر هەڵدەگرن، خوا تەوفیقمان بدات ئەوەی دەیزانین بیشیتوانین و حاڵیی بوونەكەمان لە خۆماندا بكەینە حاڵ.

ئایا پێگەیاندنی سەرکردە ئەرکی کێیە؟ بێگومان ئەرکی هەموو لایەکە، کە لێرەدا باسی حەوت پێکهاتەی کۆمەڵگا دەکەین: خێزان، قوتابخانە و زانکۆ، مزگەوت، ڕاگەیاندن، حیزبە سیاسییەکان، ڕێکخراوە مەدەنیەکان و کەسایەتییە ئەزموونداره‌کان، هەر کامێك لەو حەوت پێکهاتەیە لەسەریان پێویستە هاوکار و دەستبارگرین بۆ پێگەیاندنی سەرکردەکان، هەڵبەت ئەوە لەکاتێکدایە کۆمەڵگایەکی تەندروست هەبێ و حوکمڕانییەکی ڕەشید هەبێت، بێگومان ئەوکاتە ئەو پێکهاتانەی کۆمەڵگا، باشتر دەتوانن ئەو ڕۆڵەی خۆیان ببینن، ەلاَم ئێمە بەشێوەیەکی تیۆریی باس دەکەین، کە مەرج نیە لەم واقیعەی ئێستادا هەر کامێك لەوانە بتوانێ ئەو ئەرکەی خۆی، وەك پێویست ڕاپەڕێنێت، بەلاَم باسی ئەوە دەکەین، کە لە کۆمەڵگایەکی تەندروست و ڕێك و پێك دا، پێویستە ئەو پێکهاتانەی کۆمەڵگا هەموویان هاوکار و دەستبارگری یەکدی بن، بۆ پێگەیاندنی سەرکردەی تازە.

## ١- خێزان:

دەروونزانان دەڵێن: دە (١٠) ساڵی یەکەمی تەمەنی مرۆڤ گرنگترین قۆناغی پەروەردە و فێربوونی مرۆڤە، ئەمەش مانای وانیە کە لە دوای دە(١٠) ساڵییەوە مرۆڤ پەروەردە نابێ و فێر نابێ، بەلاَم ئەو ماوەی دە(١٠) ساڵە زۆر کاریگەرە و، لە مێژیشە گوتراوە: (العلم في الصغر كالنقش على الحجر) زانیاریی بە گچکەیی وەك نەخشی سەر بەرد وایە، هەموومان بیرەوەرییەکانی ڕۆژگاری منداڵیمان چاکتر لە بیر دەمێنن، لە بیرەوەرییەکانی دیکە و، وردریش لە بیرمان دەمێنن، بۆیە پێویستە خێزان باش قۆڵی لێ هەڵماڵێ دایك و باب و ئەندامەکانی دیکەی خێزان، قۆڵ هەڵماڵن لەوەدا کە باوەشێکی پڕ گەرم و پڕ سۆز بن بۆ پێگەیاندنی ڕۆڵەکانیان و، بەو چاوە تەماشایان بکەن کە دەبن بە سەرکردەی داهاتوو، هەڵبەتە نەك هەموویان بەڵکو ئەوانەیان کە جێی چاوانیان تێدایە، ئەویش بەوە دەبێ کە یەکەم: خێزانێکی تەندروست و دایکێکی باش دروست بکرێن، پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفەرموێ: (إِذَا خَطَبَ إِلَيْكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ دِينَهُ، وَخُلُقَهُ فَزَوِّجُوهُ، إِلَّا تَفْعَلُوا تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ، وَفَسَادٌ عَرِيضٌ)[١] واتە: ئەگەر کەسێك هات لە دین وئەخلاقی ڕازی بوون {واتە: پەیوەندیی لەگەڵ

١) أخرجه الترمذي: ١٠٨٤، وقال الألباني: حسن صحيح.

خـوا و خـەڵك دا بـاش بـوو}، هاوسـەرگیریی لەگـەڵ بكـەن و ئافرەتی پێ بدەن، ئەگەرنا ئاشووب و خراپەكارییـەكی فـراوان وڵات دادەگرێت.

بێگومان پیاو دەبێ بۆ ئافرەتی چاوبگێڕێ و، دایكێكی باش بۆ منداڵەكانی پەیدا بكات، هەروەك ئـافرەتیش دەبـێ چـاو بـۆ پیاوێكی بـاش بگێـڕێ و بـابێكی بـاش بـۆ منداڵـەكانی، كـە لـە دواییدا پەیدا دەبن و وەچەیان لێ دەكەوێتەوە، پەیدا بكات.

هەر لەو بوارەدا، ئەركی خێزانە، كە لەبواری مامەڵـە لەگـەڵ مندالەكانیانـدا، چـەند شـتێك ڕەچـاو بكـەن، كـە دەبنـە هـۆی پەروەردە بوونیان و تێدا ڕسـكان و گەشـەكردنی سـیفەتەكانی سەركردایەتیی تیایاندا، لەوانە:

أ- **ڕاوێژ پێكردن:** ئەگـەر مـرۆڤ ڕاوێـژ بـە منداڵەكـەی خـۆی بكات، كوڕە یان كچە، گەورەیە یان بچووكە، بڵێ: ڕات چییە لەو بارەوەو، چی بكەین و چۆن بكـەین؟ عـەقڵی بجووڵێنێ.

ب- **نازناوی باش بۆ بەكارهێنانی:** بڵێ: تۆ پاڵەوانیی، تـۆ شێری منی، تۆ زیرەكی، تۆ پیاوێكی خواپەرستی، تـۆ ئافرەتێكی لێهاتوو و شارەزا دەبی، هانـدان و نازنـاوی چاك بەكارهێنان كاریگەریی زۆر هەیە لـە دروسـتبوونی كەسایەتیی سەركردەدا.

ج- **ستاییشکردنی لەسەر چاکە:** ئەو منداڵە کە چاکەیەك دەکات، ستاییشی بکە لەسەری و، بە پێچەوانەشەوە، کە خراپەیەکیش دەکات، سەرزەنشتی بکە، بەلاَم دیارە هەمووی بە پێودانگی خۆی.

د- **ڕامێنانی لەسەر هەقبێژیی و ڕاستگۆیی:** زۆر گرنگە ک منداڵ لەسەر هەقبێژیی و ڕاستگۆیی و لەسەر نەزاکەت و نەجابەت باربهێنرێ و ڕابهێنرێ.

هـ- **گێڕانەوەی بەسەرهاتی پەند هەلگر:** بەسەرهاتی وا بۆ منداڵەکان بگێڕەوە، کە پەندی لێ وەربگرن، بڵێ: فلاَنکەس ئاوا عەییدار بوو و، فلاَنکەس ئاوا چاك کرد و، دوایی خەڵك و خوا خۆشیانی ویست، فلاَنکەس خواپەرست بوو بەو شێوەبوو، فلاَن ئەو تاوانەی کرد، بۆیە ئەو نسکۆیەی بەسەر هات.

و- **باب و دایك سەرمەشقن:** باب و دایك دەبێ زۆر لە خۆیان وریا بن و، هەر شتێك منداڵ لە باب و دایکیان ببینێ، لە دڵ و مێشکیدا تەبع دەبێ و ئەوان سەرمەشق و پێشڕەوی ئەو منداڵەن، چی لەوان ببینێ دیارە ئەو بە چاکی دەزانێت.

ز- **خۆپاراستن لە شکاندنی:** بێگومان دەبێ گوێ بادان و ڕەخنەگرتن و سەرزەنشت کردن هەبێ لەسەر خراپە،

بەلأم ئەوە سەرنەکێشیّ بۆ شکاندن و وردوخاشکردنی و، منداڵەکە وای لیّ بیّ لە خۆی نائومێد بیّ و، خۆی لەبەرچاو بکەویّ و، پێی وابیّ بە کەڵکی هیچ شتێك نایەت.

ئەوە لەبارەی خێزانەوەو، دەشگونجیّ زۆر لەوە زیاتر لەو بارەوە قسە بکرێت.

## ٢- قوتابخانە و زانکۆ:

دەتوانین بڵێین مامۆستا چ لە قوتابخانە چ لە زانکۆ سیّ ئەرکی لەسەر شانن:

أ‌-مامۆستا دەبیّ سەرمەشق بیّ لە هەموو ڕوویێکەوە بۆ قوتابییەکانی خۆی، لە ڕووی دینداریی و دنیاداریی و مەعریفەت و نەجابەت و لە ڕووی هەڵوێستی باش و ڕەوشتی بەرز و لە هەموو ڕوویێکەوە، هەندێك لەو مامۆستایانەی کە لە قۆناغی سەرەتایی دەرسیان پێکوتووم و، چییان پیّ گوتووم، ئێستاش هەر لە بیرمە و لە هۆشدانم دا هەڵگیراوە.

ب- پێویستە مامۆستا لە دامەزراوەکەی خۆی دا بەردەوام گەشە بە خۆی و دامەزراوەکەی بدات، نابیّ هەر بە شێوازی کلاسیك و کۆن، کە کاتی بەسەر چووە، وانە

بڵێتەوە، چونکە ئێستا شێوەی تازە هەیە بۆ وانە پێ گوتن و فێرکردن و ڕاهێنان و بارهێنان، دەبێ شێوە تازەکان بگرێتەبەر، ئەوانەی بە ئەزموون سەلمێنراوە، کە باشترن و بەرهەمی باشتر بەدەستەوە دەدەن و قوتابییەکان باشتر پێ دەگەیەنن و تێدەگەیەنن، لێرەشدا دەبێ لە خۆمان وریا بین، هەر لە خۆوە نەکەوینە دوای هەڵڵای مام کوێخا: با خوێندنی سویدیی بێنین و، خوێندنی دانیمارکیی بێنین و، هی کوێ و کوێ بینین!! هەرگیز لەگەڵ چاولێکردنی کوێرانەدا نیم، چونکە لاساییکردنەوەی کوێرانە سوود ناگەیەنێ، بەڵکو سەرەنجامی خراپ و پەشێمانیی بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

ج- مامۆستا بەرامبەر بە قوتابییەکانی پێویستە مشووریان لێ بخوا و، هانیان بدات لەسەر گەشە بەخۆدان و بەرەو پێش هەنگاونان، ئەویش:

١- بە هۆی گوێ بۆ گرتنیانەوە، متمانەیان بە خۆیان زیاد بکات، گوێیان بۆ بگرێت و دیالۆگیان لەگەڵدا بکات، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی متمانەیان بە خۆیان ڕوو لە زیادبوون بکات، نەك هەر قوتابییەك قسەیەکی کرد لە دەمی بداتەوە، بەڵکو دەبێ گوێی

بۆ بگرێ و قسەکەی لێ وەرگرێ، ئەوکاتە هەم مامۆستایەکە لەلای ئەو قوتابییە بەڕێزتر دەبێ و، هەم ئەو قوتابییەش، کە سەرنج و تێبینییەکی هەیە، مامۆستایەکە لێی بەهرەمەند دەبێ.

٢- هانیان بدات لەسەر وتوویژ و پرسیارکردن و لێکۆڵینەوە و، ئازادیی بیرورایان پێ بدات، هەڵبەتە نەك بە بەرهەڵدایی، بەلام ئازادییان پێ بدات، گوزارشت بکەن لەسەرنج و بیروبۆچوونەکانی خۆیان.

٣- کاتیان بداتێ بۆ بیرکردنەوە و داهێنان، هەندێك شتیان بداتێ بیر لێ بکەنەوە و، کاتیان پێ بدات کردنەوە و وەلامدانەوەی.

٤- سەرچاوەکانی فێرکردنیان بۆ زۆر و جۆراوجۆر کات، تاکو ئاسۆی بیریان فراوان و کراوە بێ.

٥- ڕەچاوی جیاوازیی و ئاستەکانیان بکات، قوتابییەکانی هەموو لە یەك ئاستدا نین، ئەوانەی زیاتر توانایان هەیە، دەگونجێ زیاتر گرنگییان پێبدا و زیاتر بایەخیان پێ بدات، واتە هەر کەسە و بە قەدەر خۆی، چونکە لەو ڕووەوە کە هەموویان قوتابین، بە یەکسانیی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، بەلام لەو ڕووەوە کە هەندێکیان توانایان زیاترە،

دەبێ ئاگای لێ بێ، كە لە بەر ڕەچاوكردنی ئەوانەی توانایان كەمترە، ستەم لەوانە نەكات كە توانایان زیاترە، هەر كامێكیان وەك خۆی مامەڵەیان لەگەڵدا بكات، ئەوە دادگەرییە، بۆیە مەرج نیە هەمیشە دادگەریی لە یەكسانیی دابێت.

### ٣- مزگەوت:

مزگەوتەكان ئەگەر بەو شێوەیەی كە شەریعەت دەڵێت مامەڵە بكەن لەگەڵ خەڵكدا، مزگەوتەكانیش كانگایەكن و سەرچاوەیەكن، هەم بۆ پەروەردەكردنی ئیمانیی و فێركردنیی پەرستشەكان و، هەم پەروەردەكردنی زانستیی و ڕۆشنبیریی، هەم پەروەردەكردنی كۆمەڵایەتیی، هەم پەروەردەكردنی سەركردەیی و سەرمەشقیی و، گەلێك جۆری دیكەی پەرەردەیی.

مزگەوت كاتی خۆی زۆر ڕۆڵی خۆی بینیوە، ئەوكاتەی مزگەوتەكان سیاسەت و حیزب دەستی تێ نەخستبوون و شەخسەنە نەكرابوون، بۆیە پێویستە مزگەوت كارا بكرێتەوە و بەو شێوەیەی لێ بكرێت، كە خەڵكی تێدا پەروەردە بكرێت، لە ڕووی ئیمانیی و ڕووحیی و، ڕووی زانستیی و، لە ڕووی كۆمەڵایەتیی و ئەخلاقیی و، لە ڕووی فەرماندەیی و لە هەموو ڕوویێكەوە، پێویستە خەڵك لە مزگەوت دا پەروەردە بكرێن،

هەڵبەتە ئەویش بەوە دەبێت، كە مزگەوتەكان ئازاد بن و، ئەو ماموٚستایەش كە لە مزگەوتەكە دەبێ و، ئەو كەسەشی كە سەرپەرشتیی مزگەوتەكە دەكات، بە عەقڵێكی كراوە و دڵێكی گەورەوە، لەگەڵ هاموشۆكەرانی ئەو ماڵی خوایەدا مامەڵە بكات.

## ٤- ڕاگەیاندن:

بەداخەوە بە زۆریی وایە كەناڵەكانی ڕاگەیاندن، ڕۆڵی خراپ دەگێڕن، لە گوێ پێ نەدان و لە ناشیرینكردنی بەها بەرزەكان داو، لە هاندان بۆ خراپە و، جوانكردنی خراپەكاران، بە تایبەتی هی بەرپرسانی ستەمكار و، كوشتنی هەستی بەرپرسیارییەتی لە خەڵكدا و، سەرقاڵكردنی خەڵك بە غەریزە و هەست و نەستەكانی خۆیانەوە.

پێویستە ڕاگەیاندن هیچ كۆت و بەندێكی حیزبیی و سیاسیی لەسەر نەبێ و، سیاسەتێكی ڕەشید و سەرڕاستانە بخاتەڕوو، هەروەها پێویستە لە ڕاگەیاندنەوە ڕێز لە سەركردە ڕەسەنەكان بگیرێ، نەك وەك هەندێك كەس فێر بووە، هەموویان وەك یەك باس دەكات، وتاربێژێك دەڵێ: ئەو حیزبانە هەموویان وەك یەكن، ئەو خەڵكە هەمووی وەك یەكە، ئەوە حوكمێكی زۆر زاڵمانەیە و هیچ ئینساف و لۆژیكی تێدا نیە.

خوای دادگەر بۆ خاوەن كتێبەكانیش دەفەرموێ: ﴿لَيۡسُواْ

سَوَآءً﴾آل عمران(١١٣). واتە: خاوەن کتێبەکان وەك یەك نین، هەیانە بە ئینسافە و هەشیانە بێ ئینسافە، هەیانە لەگەڵ دینەکەی خۆی دا ڕاست دەکات و هەشیانە درۆ دەکات، مەڕ بە پێی خۆی و بزن بە پێی خۆی، هەر کەسەو دەبێ وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵ بکرێ.

هەروەها ڕاگەیاندن دەبێ ڕۆڵ ببینێ لە هیوادار و گەشبینکردنی خەڵك دا و، ڕۆڵ ببینێ لە هاندانی خەڵك دا، بۆ بەرزیی و ڕەواج پێدانی بەها بەرزەکان، ڕاگەیاندن ئەگەر بە دەست کەسانێکی بەرپرسەوە بێ، واتە: کەسانێك هەست بە بەرپرسیارییەتیی بکەن بەرامبەر دین و ژینی کۆمەڵگا، بەرامبەر بە خوا و خەڵك، دەتوانێ ڕۆڵێکی زۆر کاریگەر بگێڕێ، بەڵام بە داخەوە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی ئەم وڵاتەی خۆمان، هەرێمی کوردستان و عێراقیش و زۆربەی وڵاتانی ئیسلامییش، زیاتر بە دەست کەسانێکەوەن کە پارەدارن و موقەددەراتی خەڵك و وڵاتیان دەست بەسەر داگرتوە، بە پارەی بەلاش، کە بە ئاسانیی و زۆرداریی و قۆرخکاریی هاتۆتە دەستیان، ئەو کەناڵانە دەگێڕن و، هەروەها بۆ کەناڵەکەش ئەو بەرنامانە دادەنێن، کە چۆن کەناڵەکەی خۆیان قەرەباڵغتر بکەن، نەك چۆن خەڵك تێ بگەیەنن و پێ بگەیەنن و پەروەردە بکەن؟ یاخود جاری وایە هەر مەسەلەی قەرەباڵغکردنیش نیە، بەڵکو

هەنـدێك ئامـانجی پێشـوەختە بیرلێكـراوە و دانـدرا و نەخشـە كێشراو، جێ بەجێ دەكەن، لە هەندێك لەو بەرنامانەی كە لە كەناڵەكان دا هەن.

## ٥- حیزبە سیاسییەكان:

پێكهاتـەی پێنجـەمی كۆمـەڵگا كـە دەبـێ ڕۆڵ بگێـڕێ لـە پێگەیانـدنی سـەركردەدا، بریتیـە لـە حیزبـە سیاسـییەكان، ئـەویش بـەوە دەبـێ پـێش هـەموو شـتێك حیزبێكـی سیاسـیی لەگەڵ ئەندامەكانی خۆیداو، لەگەڵ شوێنكەوتووەكانی خۆیداو، لە نێو خۆیدا بەڕاستیی ئازادی بـیرورا پیـادە بكـا و، ڕەخنـە و ڕەخنە لە خـۆگرتن هـەبێ و، گـوێ بـۆ یەكـدی گـرتن هـەبێ و، دیكتاتۆریی و خۆ فەرز كـردن نـەبێ و، كەسـێك لـە حزبەكەتـدا هیچ ئیمتیازێكی نەبێ، بـەبێ هـەق، هـەر لەبـەر ئـەوەی كـوڕی فلاَنكەسەو خزمـی فلاَنكەسـە، یـان پـارەی زیـاترە، چاوسـوور بكاتەوە لەوی دیكە، یان ئەوانی دیكە وەك داشی دامە تەماشـا بكـات ! ! بەداخـەوە حیزبـەكانی هـەرێمی كوردسـتان ئـەو حاڵەتانەیان زۆر تێدایە، ئنجا حیزبێك نـەیتوانیبێ ئەندامـەكانی خۆی ئازاد و ئازا بكا و پەروەردە بكات، چۆن دەتوانێ خەڵك و كۆمەڵگا پەروەردە بكات، بە دڵنیاییەوە: (مـن لم یكـن لنفسـە فكیف یكون لغیره).

### ٦- ڕێکخراوە مەدەنییەکان:

ڕێکخراوە مەدەنییەکان دەگونجێ ڕۆڵی زۆر باش بگێڕن لەسەر ئاستی وڵاتان، هەندێك ڕێکخراو هەن تایبەتن و، پسپۆڕن لە پێگەیاندنی سەرکرداندا، خولیان بۆ دەکەنەوە و کتێب دەنووسن و مەشق دەکەن، هەندێك لە ئەندامانی حیزبەکانی کوردستان لە هەندێك لەو خولانەدا بەشداربوون کە دڵنیاییەوە بەهرەشیان وەرگرتوە.

### ٧- کەسایەتییە ئەزموونداره‌کان:

ئەوانیش دەتوانن ڕۆڵی زۆر گەورە و گرنك بگێڕن، ئەوانەی ئەزموونداڕن و بە قۆناغەکانی مێژوودا تێپەڕیون و تەمەنێکیان هەیە و ئەزموونیان هەیە، دەگونجێ زۆر بەهرەیان لێ وەربگیرێ و، ئەوانە دەبێ بەهرەکانیان بە هی خۆیان نەزانن، ئەوەی کە لەلایانە و کەڵەکەیان کردوە و کۆیان کردۆتەوە، بەرهەمی خەباتی چەند ساڵەی خۆیانە، پێویستە بە موڵکی خەڵکی بزانن و، خۆیشی ئەندامێکە لەو کۆمەڵگایەدا و، پێویستە ئەو ئەزموون و شارەزاییە کەڵەکەبووەی کە لەلایەتی، بە شێوەیەك لە شێوەکان بیگەیەنێ بە خەڵك، کە خۆشبەختانە کەسانێك هەن، لەبەر هەر هاندەرێك بێ، ئەزموونی خۆیان نووسیوەتەوە و دەینووسنەوە، یان چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا دەکرێ، ئەوە شتیکی زۆر باشە، بەڵام

دیاره کەسێك كە ئەزموونی خۆی باس دەكات، مێژووی خۆی باس دەكات، دەبێ زۆر ورد بێ و بابەتییانه و بە ئینساف بێ، نەك وا مێژووەکە وێنا بکات، کە هەر خۆی تێدابووه لەو کاتەداو، لەو ڕووداوەدا و، ڕۆڵی ئەوانی دیکە زەڕبی سفر بکات، بەڵکو پێویستە بە وردیی و ئینسافەوە، قسە بکات و بەس ئەوه نەبێ خۆی دەربخات و، خەڵکی دیکە بخاتە پەڕاوێزەوە.

ڕێزان !

هەندێك كۆسپ و لەمپەر هەن، ڕێ دەگرن لەوە، كە مرۆڤ بە پەیژەدا سەركەوێ، بەرەو ئەوەی ببێتە سەركردە، ببێتە بەرپرس، ببێتە مشوور خۆر، كە دەتوانین بڵێین: ئەو كۆسپ و پەرچانە دوو بەشن:

یەكەم: پەرچە خودییەكان

دووەم: پەرچە دەرەكییەكان

## یەكەم: پەرچە خودییەكان:

لەو بوارەدا سێ پەرچ و لەمپەرم بەلاوە گرنگتر بوون، ئەوانیش:

### ١- متمانە بەخۆ نەبوون:

متمانە بەخۆنەبوون و باوەڕ بەخۆنەبوون و خۆ پێ هیچ بوون، ئا ئەوە گەورەترین ئاستەنگ و لەمپەر و پەرچە لەبەردەم مرۆڤ دا، كە بەرەو سەركردایەتیی و بەرەو بەرپرسیارییەتیی بچێ و، بەرەو ئەوە بچێت خۆی پێ بگەیەنێت، كە بتوانێ مشووری كۆمەڵگا و دەوروبەری خۆی بخوات.

چارەسەری متمانە بەخۆ نەبوونیش لە چەند شتێکدایە:

**أ/** پشت بە خوا بەستن و پەنا پێبردنی.

**ب/** ڕوونیی ئامانج لە عەقڵ و دڵ دا.

**ج/** وازهێنان لە لەخۆدان (جلد الذات).

**د/** ڕوانینی ئەرێنیی بۆ خود و بۆ واقیع.

**هـ/** جەختکردنەوە لەسەر ئەرێنییەکان.

**و/** هاوکاریی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا.

لێرەدا با هەڵوێستەیەك بكەین و، هەڵوێستێكی مێژوویی بێنین لە نێوان (ئەبوو بەكری صیدديق) (خوای لێ ڕازی بێ) و (عیكریمەی كوڕی ئەبوو جەهل)دا: ئەبووبەكر (خوای لێ ڕازی بێ) عیكریمەی كوڕی ئەبوو جەهلی نارد بۆ جەنگ لە دژی موسەیلەمەی كەززاب و سوپایەكەی دا، بە دوای ئەویش دا شەڕەحبیلی كوڕی حەسەنەی نارد، شەڕەحبیل كە لە دوای عیكریمە چوو، ویستی شەڕ بكات و دەنگ و سەدای شەڕەك هی خۆی بێت، خۆی پێ دادان، بەڵام ئەوان شەڕەحبیل و سوپاكەییان شكاند، ئیدی شەڕەحبیل لە ڕێگادا ڕاوەستا، دیارە پێشەكیی سوپاكەی ناردوەو شكاوە، كە هەواڵەكەی پێ گەیشت، عیكریمە (خوای لێ ڕازی بێ)، نامەی نووسی بۆ ئەبوو بەكر (خوای لێ ڕازی بێ)، بەوەی كە ڕوویداوە، ئەبوو بەكر بۆی نووسی: (یا ابن أم عكرمة! لا أرینَّك ولا تراني على حالها، لا

ترجع فتوهن الناس، امض على وجهك حتى تساند حذيفة وعرفجة، فقاتل معهما أهل عمان ومهرة)[1]. واتە: ئەی كوڕی دایكی عیكریمە! {سەرنج بدەن ئەبووبەكر چەند بە سەلیقە بووە، نەیگوتووە: عیكریمەی كوڕی ئەبوو جەهل! چونكە كوڕی ئەبوو جەهلـە و، پێشـی خـۆش نـەبووە بڵـێ: كـوڕی ئەبوولحەكـەم، مـەدحی بـابی بكـات و، پێشـی خـۆش نـەبووە زەمـی بكـات، دەڵـێ: ئـەی كـوڕی دایكـی عیكریمـە}، تـۆ مـن نەبینی و منیش تۆ بەو حاڵەوە نەبینم، بەو حاڵەتەی كە ئێستا ڕوویداوە، مەگـەڕێوە تـاكو خـەڵك بـێ هێـز بكـەی، بـەڵكو بـڕۆ پشتگیریی حوزەیفە و عەرجەفە بكە، {ئەوانیش دوو فەرماندە بوون}، لەگەڵ ئەواندا، ئەو سوپایەی كە تۆ پێتە، بچۆ پشـتی ئەوان بگـرەو، دژی خـەڵكی عوممـان و مـەهرە بجەنگـە، بـەڵام مەگەڕێوە دوایی ئەژنۆی خەڵكی بشكێ و بڵێن: شكاون.

كەواتـە: گرنگـە متمانـە بـەخۆبوون هـەبێ و، متمانـە بـەخۆ نەبوون، پەرچ و كۆسپێكی گەورەی ڕێی بوونە سەركردەیە.

### ٢- نا ئومێدیی و بێ هیوایی و ڕەشبینیی:

بێ هیوایی و ڕەشـبینیی، ژەهـرە بـۆ ڕووحـی مـرۆڤ، دەبـێ مرۆڤ خۆی لێ بپارێزێ، هەڵبەتە هیچ كەس ژیانی لـە كۆسـپ و

---

١) تأريخ الطبري ج٣ ص ٢٨١.

ئاستەنگ و لە مپەر خاڵیی نابێ، بەلاَم بێگومـان ئـەو کۆسـپ و ئاستەنگ و لە مپەرانە، ئەگەر ئیرادەیەکی بـەهێزتر لـە خۆیـان ڕووبـەڕوویان ببێتـەوە، دەبنـەوە پـووش، ئێمـە وەك خـەڵکی کۆمەڵی ئیسلامیی، کـە ئـەوە تەمـەنی کۆمـەڵی ئیسـلامیی بـۆ نزیکەی بیسـت سـاڵ دەچـێ، قۆنـاغی زۆر سـەختمان بڕیـون و هـەوراز و نشـێوی زۆرمـان بینیـون و، حاڵـەتی وامـان بەسـەر هاتوە، کەس بەتـەمای سـەری خـۆی نـەبووە، بـەلاَم ئـیرادەی ئێمـە بـەهێزتر بـوو لـەو کۆسـپ و لەمپەرانـە و بڕیومـانن و، ئێستاش بە سـەربەرزیی لـە گۆڕەپـان و مەیدانەکـە ماوینـەوە، بۆیە دەبێ مرۆڤ خۆی بپـارێزێ لـە بـێ هیـوایی و نائومێـدیی و ڕەشبینیی، ئەویش بەم ڕێگایانەی خوارەوە:

أ– بیرکردنـەوەی ئـەرێنیی و تێشـکاندنی هەسـت و نەسـتی نـەرێنیی لـە خۆیـدا، واتـە دڵـی خـۆی بـژار و خـاڵیی بکاتەوە لە بێ هیوایی و ڕەشبینیی.

ب– هەمیشـە هەوڵبـدات مەعنـەویاتی خـۆی و دەوروبـەری بەرز بکاتـەوە.

ج– زاڵ بێ بەسەر تۆوی شەرمکردن و ترس و لەرزدا.

پێغەمبەریش (علیه الصلاة والسلام) فەرموویەتی: (واعلم ان النصر مع الصبر، و أن الفرج مع الكرب، وأن مع العسر

يسراً)[١]. واتە: بزانە کە سەرکەوتن لەگەڵ خۆڕاگرییە و، دەروو لێکرانەوە لەگەڵ تەنگانەیە و، لەگەڵ سەغڵەتیشدا ئاسانیی هەیە.

٣- ترس لە تێشکان و لە داهاتوو:

هەر کەسێك هەمیشە چاوی لەسەر تێشکان و دۆڕان بێ ناتوانێ بەرەو ئەوە بچێت، کە ببێت بە بەرپرس و مشوورخۆرێك، ئەمەش چارەسەرەکەی بە چەند ڕێگایەك دەبێت:

أ- هەمیشە هەوڵ بدات ڕووحی تێرو تەسەل بێ، بە خۆراکی ئیمان و تەقوا و یادی خوا: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾

ب- ئەگەر حاڵەتی پشوو سواریی و دڵتەنگیی و ڕەشبینیی هاتە پێش، دەبێ پشوو بدات و بیرکردنەوەی ئەرێنیی لە خۆیدا بێنێتەدی.

ج- گرفت و کێشەیەك کە دێتە پێش، تێیەوە ڕانەمێنێ دەستەئەژنۆ، بەڵکو خۆی پێدابدات و لێی بچێتە پێش.

د- هەوڵبدات لە بۆشایی دا نەژیە و کاتەکاتی پڕ بن لە ئیش و کار، چونکە لە بۆشاییدا ژیان مرۆڤ وا لێ دەکات بیر

---

١) أحمد: ٢٨٠٣ شعيب: حديث صحيح.

بكاتەوە و خەیاڵی بەملا و ئەولادا بچێ و، شەیتان دنەدان و خوتخوتەی خراپی بۆ بكات.

هـ- خۆ ڕازاندنەوە بە پتەویی و مەحكەمیی، بەردەوام دەبێ هەوڵ بدات مەحكەم بێ.

و- ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوەی كە جێگای مەترسییە، وەك ئەوەی كە لەم ئایەتە بەپێزەدا هاتوە: ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ المائدة.

واتە: كاتێك مووسا و هاڕوونی برای (علیهم الصلاة والسلام) خوای تاك و پاك فەرمانیان پێ دەكات بچن بۆ ئەو شارە و بیگرن، خەڵكەكەی ئامادن نابن و دەڵێن: ﴿إِنَّ فِيهَا قَوۡمًا جَبَّارِينَ﴾ خەڵكێكی زۆر ستەمكار و بە دەسەڵاتی لێیەو ئێمە ناتوانین، كەچی دوو پیاو لەوانەی لەخوا دەترسان و ترسی خوایان هەبوو، نەك ترسی مرۆڤەكان و خوا چاكەی لەگەڵ دا كردبوون، گوتیان: ڕێك خۆ بە دەروازەی شارەكەیاندا بكەن، {دوای خۆ ئامادەكردن}، ئنجا ئەگەر خۆتان پێ داكرد، ئێوە زاڵ دەبن و سەركەوتوودەبن.

ز- خاڵێكی دیكە بۆ چارەسەركردنی ترس لە تێشكان و لە داهاتوو، بریتیە لە دووبارە كردنەوەی ئەزموون و هەوڵەكان و نەبەزین و پاشەكشە نەكردن، هەیە لەگەڵ هەوڵدانی بۆ شتێك

ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو، یەکجاریی تۆبە لەو کارە دەکات، نەخێر بەڵکو جارێك شکستت هێناوە، بیکە دوو، بیکە سێ، لە کتێبێکدا خوێندوومەتەوە، دەڵێ: فەرماندەیەك، کە لە جەنگێکدا تێشکابوو و سوپاکە پەڕاگەندە بووبوو، لە شوێنێك زۆر ماندوو بوو پشووی دا، لە ولاغەکەی هاتە خوار، لەسەر شارە مێرووێك دانیشت و تەماشای کرد: مێروولەیەك شتێکی بە دەمەوە گرتبوو، ژماردی ئەو مێروولەیە پێنج سەد جار، یان هەزار جار هەوڵی دا سەری بخات، بەڵام هەموو جارێ هەر لێی بەردە بۆوە، کەچی جاری پێنج سەدو یەکەم، یان جاری هەزار و یەکەم، سەری خست، فەرماندەکە گوتی: من یەکجار تێشکاوم، با جارێکی دیکەش سوپایەکەم کۆبکەمەوە، ئەوە بوو سوپایەکەی کۆکردەوە و، بۆ جاری دووەم هەوڵی دووەمی دا، هەوڵەکەی بەری گرت و سەری گرت.

## دووەم: پەرچە دەرەكییەكان

پەرچە دەرەكییەكانی بوونە سەركردە:

### ١- موونافەسەی ناڕەوا:

مرۆڤ هەمیشە هەندێك خەڵكی هەر لێ هەڵدەكەون، كە حەسوودیی پێ بەرن و ناخیان ڕەش بێ بەرامبەری، با لەویشەوە خەتا نەبێ، دەبێ مرۆڤ خۆی بۆ ئەوە هەڵگرێ هەمیشە (كُلُّ ذِي نِعْمَةٍ مَحْسُودٍ) هەموو خاوەن چاكەیەك حەسوودیی پێ دەبردرێت.

### ٢- تێڕوانینی تاكڕەوانە:

هەندێك كەس هەیە تەنها خۆی دەخوێنێتەوە و سەرسامە بەڕای خۆی و، حیساب بۆ كەسی دیكە ناكات، دەتوانین لە ڕووی مێژووییەوە ئەم بەسەرهاتە بێنین، كە عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) (أبو عبيدة الثقفي) كردە بەرپرس و، ڕایسپارد ڕاوێژ كات و، كردی بە بەرپرسی بەشێك لە سوپایەك، كە بۆ وڵاتی فارسی نارد، بەڵام لە ساڵی (١٣)ی كۆچیی دا، كە فارسەكان بە چوار(٤) هەزار كەسەوە هاتن، هەرچەندە (المثنى بن حارثة) پێی گوت: بۆیان نەپەڕیەوە، بەڵام ئەو گوتی: (جَبنتَ يا أخا بكر) ئەی فلانكەسی عەشیرەتی بەكر تۆ ترساوی،

ئەوەبوو پەرپەوە و سەرەنجام گوتراوە خۆی و هەر چوار هەزار (٤٠٠٠) کەسەکەی کوژران، یان خنکان و، یەکێکیان دەربازی نەبوو[1].

٣- حوکمی خۆسەپاندن و خراپەکاریی ئیداریی:

ئەمەش بێگومان کاریگەریی زۆری هەیە لەوەدا، کە کۆسپ و لەمپەرێکی سەختە لە بەردەم پێگەیشتنی سەرکردان دا چونکە:

أ- کەسی خۆسەپێن هەمیشە پێی خۆشە (العملاق بین الأقزام) بێت، هەندێك کەس هەیە، ئەوانەی بە خۆسەپاندن و بە ناهەق حوکمڕانیی شوێنێکیان دەکەوێتە دەست، یان دەسەڵاتێکیان دەکەوێتە دەست، کەیفیان بە پیاوان و خەڵکی بە توانا نایەت، پێیان خۆشە دەوریان خەڵکی بوودەڵە و خەڵکی دەست لە سینگدەر و ماستاوچیی بێت.

ب- بابای خۆسەپێن ڕووحی مەعنەویی لە خەڵك و دەوروبەریدا دەکوژێ.

ج- دەستتێوردانی ئەمنیی دەکات، بۆ دیاریی کردنی بەرپرسەکان، واتە تەماشا دەکات کێ زیاتر لەگەڵ ئەودا دەگونجێ و کێ لەوی نزیکترە و، کێ زیاتر بەڵێی بۆ دەکات،

---

١) الأخبار الطوال، أبو حنيفة أحمد بن داود الدينوري، ص ١١٣.

نەك كێ زياتر بەكەڵكی كارەكە دێت؟ كە ئەمە زۆر بە زەقيی لە هەريمی كوردستانی خۆمان دا دەيبينين.

د- بەرتيل دان و واستە و واستەكاريی، زۆر ڕۆڵ دەبينێ، لە حوكمڕانييەكەی دا.

هـ- بە ميراتكردنی سەركردايەتيی، جارێ بۆ خۆی هەر هەيە، جێ خۆش دەكات بۆ كوڕەكەی، قەزاف وای دەكرد بۆ (سيف الإسلام)ی كوڕی، حوسنی موبارەك وای دەكرد بۆ جەمالی كوڕی، عەلی عبدالله صالح وای دەكرد بۆ ئەحمەدی كوڕی، هەموو ئەو تاغووتانە هەروايان كردوە و هەرواش دەكەن، كە سەرەنجام بابای ديكتاتۆر بۆ خۆشی لە بەين دەچێ و بە كوڕەكەشی ناگات.

٤- پيلانگێڕی دەرەكيی:

ئەمەش پەرچێكی ديكەيە كە بەداخەوە لەم جيهانی ئيسلامييەی ئێمەدا، بە هەرێمەوە، بە عێراقەوە، بە دەوروبەرەوە، لە ئەنجامی بێ هێز و پێزيی خەڵك و، بێ هێز و پێزيی لايەنە سياسييەكان و، بێ هێز و پێزيی قەوارە سياسييەكان دا، وەك داشەی دامە وان بە دەست زلهێزەكانەوە و، ئەوان بڕيار دەدەن: كێ چی بێ و كێ چۆن بێ؟ سەرۆك وەزيرانێك دادەنرێ، دەبێ ئۆكەی و ڕەزامەنديی ئەوانی لەسەر بێ، كەسێك پۆستێكی پێ دەسپێردرێ، دەبێ

ئەوان ڕەزامەند بن، ئەگەر ڕازی نەبن، نابێت، هەڵبەتە ئەوە لەسەر ئاستی دەوڵەتان، زۆر جار لەسەر ئاستی حیزبەكانیش، بوون كاریگەرییان هەیە و، لەوەش دا دەستتێوەردان دەكەن، ەڵام چارەسەر ئەوەیە:

**أ- وریایی بەردەوام:** هەمیشە دەبێ ئەهلی ئیسلام لە خۆیان وریا بن: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ خُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ﴾ النساء(٧١)

**ب- دڵنیا بوون لە یارمەتیی خوا، بەمەرجی ئیمانداریی:** مەرجێك ئەهلی ئیمان بن، خوای باڵادەست لەگەڵیانە و پشتیوانیان دەبێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الأنفال .

**ج- هۆشیاریی یەكڕیزیی و برایەتیی:** هۆشیاریی یەكڕیزیی و تەبایی و برایەتیی زۆر بڵاوبكەنەوە.

**د- دەستنیشانكردنی پیلانگێڕان و پیلانەكانیان:** ئەوانەی پیلان دەگێڕن، یان ئەوانەی سەر بە پیلانگێڕەكانن دەستنیشانیان بكەن و دیارییان بكەن، بۆ ئەوەی خەڵك بە پیلان و فێڵ و تەڵەكەكانیان هەڵنەخەڵەتێ.

لە تـەوەری چـوارەمدا چـل(٤٠) خەسـڵەت و ئـەرکمان بـاس کردن بۆ کەسێك کە بەرپرس و سەرکردە بێ، دەتوانین بڵـێین: پێچـەوانەی ئـەو (٤٠) خاڵــە هــەموویان ئەوانــەن، کــە دەبــێ سـەرکردە خۆییـان لـێ بپـارێزێ، بـەڵام لێرەدا لـە پـازدە(١٥) خاڵان دا پازدە جۆرە نەخۆشیم هێناون، هـەموویان نەخۆشـیی گورچکبڕن و، کەسی سەرکردە دەبێ خۆییان لێ بپارێزێ و بـە دوور بگرێ، ئەو پازدە نەخۆشییانەش:

١- خۆ بەزلگریی و خۆپەسندیی:

هەڵبەتــە هــەموو مروڤێـك پێـی خۆشــە بــوونی هــەبێت و، هەموو کەسێك خۆی خۆش دەوێت و، بەرگری لە بـوونی خـۆی دەکـات و، پێـی خۆشــە ناوونـاوبـانگی باشــی هــەبێ، ئــەوە هەستێکی سروشتییە، ئیبراهیم خلیل الله (علیه الصلاة والسلام) لە خـوا دەپارێتــەوە: ﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ٨٤﴾ نـاوی چاکم لە نێو خەڵکیدا بڵاو بکەوە، خوای کارزانیش دوعایەکـەی قبووڵ کرد، ئێستا ئیـبراهیم (علیه الصلاة والسلام) پێغەمبـەرێکی نێونەتەوەییــە: جوولەکــە، نەســرانیی، مســوڵمان، ســابیئە، مەجووسـی، هــەموو خـاوەن بەرنامــە ئاسمانییــەکان، ڕێـز لــە ئیــــبراهیم (علیه الصلاة والسلام) دەگــــرن، خــــوای بەخشــــەر دوعایەکەی چاك قبووڵ کردوە.

كەواتــە: ئــەوە كــە مــرۆڤ بیــەویٚ بــوونی هــەبیٚ و، ڕێــز و حورمەتی هەبیٚ و، پێگەی هەبیٚ، هەستێكی سروشتییە، بـەلاّم خۆبـەزلگریی و خۆپەسـندیی، لـەوە جیایـە، مسـولّمان دەبـیٚ هەولّبدا عیززەتی هەبێت، بەلاّم خۆی لە خۆبەزلگریی بپـارێزیٚ، (ابن قيم الجوزية) لە كتێبی: (مفتـاح دار السـعادة) و (الـروح) و لە چەند كتێبێكی دیكەی خۆیدا، بەراورد دەكات لە نێوان هەندێك لـە سـیفەتەكاندا دەلّـیٚ: لـە نێـوان خۆبـەزلگریی و عیززەتمەندیی دا، هێلّێكی باریك هەیە، ئەگەر لـە عیـززەت تـیٚ پەڕی، دەبێتە خۆ بەزلگریی، عیززەتمەندیی ئەوەیە، كە تۆ بـە بـیٚ ڕەچـاوكردنی ڕێبـاز و شـێوازێكی ناشـەرعیی، هەولّبـدەی كەرامەت و ڕێز و حورمەتی خۆت بپارێزی، نەك لەسەر حیسابی خەلّكێكی دیكە، بەهۆی شكاندنی خـەلّكیكی دیكـەوە، بـەلّكو خۆت ئاگات لە خۆت بێت، بـەلاّم خۆبـەزلگریی و خۆپەسـندیی ئەوەیـە، كـە هـەر خـۆت ببـینی و خـەلّكێكی دیكـە نـەبینی و، دەربەستیش نەبی هەر ئامڕازێك و هەر شێوازێك بـەكاربێنی بـۆ خـۆ بـەرز كردنـەوە، كـە ئـەوە ڕێـك پێچـەوانەی ئـەو ئایەتـە بەپێزەیـە، كـە دەفـەرمویٚ: ﴿تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ (٨٣)﴾ القصص. واتـە: ئـەم مـەنزلّگای كۆتاییـە دایـدەنێین بـۆ كەسـانێك كـە

نایانەوێ خۆیان بەرز بكەنەوە لە زەویدا و، ناشیانەوێ تێكدان بكەن لەسەر زەویدا و، سەرەنجام بۆ پارێزكارانە.

بێگومان كەسێك ئەهلی تەقوا بێ، خۆی لە بەزركردنەوە و خۆپەسندیی و خۆبەزلگریی و تێكدان لەسەر زەوی دەپارێزێت.

٢- شوێن هەواوئارەزوو كەوتن:

مرۆڤ خوای تاك و پاك وای خوڵقاندوە، وەك ئامێرێك نیە، كە قورمیشی بكەی و كاری خۆی بكات، بەڵكو مرۆڤ عەقڵی هەیەو، هەوا و ئارەزووی هەیە و، دەتوانێ بەرەو بەرزیی بچێ و بەرەو نزمیی بچێ، ڕاست بڕوات و چەوت بڕوات، بۆیە پێویستە مرۆڤ ئاگای لە هەواو ئارەزووەكانی خۆی بێ و، ئاگای لە حەز و ویستەكانی خۆی بێ، لە سنووری شەرع و لە بازنەی ڕێ پێدراوی ڕەوا نەچنەدەر.

٣- نزیكخستنەوەی خەڵكی ماستاوچیی:

بەرپرس دەبێ زۆر ئاگای لەوە بێ، تەماشای ئەوە نەكات كێ زیاتر ماستاوی بۆ دەكات و، كێ زیاتر خۆی لێ دێنیتە پێش و، كێ زیاتر بەڵێی بۆ دەكات، ئەوانە لە خۆی بێنێتە پێش، چونكە سەرەنجام دەوری بە كۆمەڵێك ماستاوچیی دەگیرێ و، كەسی بە دەورەوە نامێنێ بڵێ ئەوە وا نابێت و وا دەبێ، هەندێك بەرپرسی ئەم وڵاتە دەناسم كە دوای ئەوەی لە

دەوروبەرەکەی دەپرسم دەڵێن: کەسمان نیە پێی بڵێ: وا دەبێ و وا نابێ، دەبێ هەر بڵێی: وایە، بۆیە سەرەنجام ئەوانەی کە دەوروبەریان بەخەڵکی ماستاوچیی و هەلپەرست دەتەنرێ، ئەوەندە عەقڵەی خۆیان، کە هەیانە، هەر ئەوەیە و هیچی دیکەی نایەتە گەڵ، لە بەرئەوەی کارێکی وای نەکردوە، خەڵکێکی دیکە شتێك بخەنە گەڵ عەقڵی ئەو، هەرکەسێك عاقڵ بێ، بە عەقڵی خەڵك خۆی دەوڵەمەند دەکات و، ئەگەر زانا بێ بە زانیاریی خەڵك خۆی دەوڵەمەند دەکات، بەڵام هەر کەسێك کارێکی وای کرد، کە بۆ خۆی چەندەی عەقڵ هەیە، هەر ئەوەندەبێ و هیچی دیکەی نەهاتێ و، کەس نەبوو ڕەخنەی لێ بگرێ و، کەس نەبوو پێشنیاری بۆ بکات و، کەس نەبوو ڕایتەکێنێ و ڕایچڵەکێنێ، بێگومان ئەو جۆرە کەسانە لە لەخۆبایی بوونی خۆیان دا دەمێننەوە، هەتا واقیع بەسەریاندا دەڕووخێ.

٤- فەرق و جیایی کردن بە بێ پاساو:

سەرکردە و بەرپرس دەبێ بەیەك چاو سەیری خەڵك بکات، بە بێ بەڵگە و پاساو جیاوازیی نەخاتە نێوان خەڵکەوەو، هەموویان وەك یەك تەماشا بکا و، لە یەك ئاست لە هەموویان بوەستێ و، زۆر لە خۆی وریا بێ، کەسانێك بە حوکمی هاوڕێیەتی پێشتر، یان خزمایەتیی، یان هاوسێیەتیی،

یان بە حوكمی ئەوەی ئەو كەسە زیاتر لەگەڵی دەگونجیَ، یان قسەی نەرمی بۆ دەكات، یاخود خۆی لیَ دێنیێتە پیێش، ئاگای لیێبیَ شەیتان فیڵی لیَ نەكات و، ئەو شتانە نەبنە هۆكاری ئەوەی، ئەو كەسە، یان ئەو كەسانە، بە بیَ بەڵگە، زیاتر لە خۆی بێنیێتە پیێش، لە هەندێكی دیكەیان.

٥- بەدوای تۆڵەدا گەڕان:

هەرگیز كەسێك بیەوێت بەرپرسیاریەتیی و سەركردایەتیی بكات، بەڕووحی بە دوای تۆڵەدا گەڕان و، بە گریَ و گۆڵی دەروونیی و، لە نێو مێژوو ژیان، بەرپرسیاریەتیی بۆ ناكریَ، بەڵكو دەبیَ دڵی ساف و ساغ بیَ و بیَ غەرەز بیَ، گریمان ئەگەر گلەییەكی شەخسیشی لە یەكێك لەو خەڵكە هەبیَ، گلەییە شەخسییەكە نەهێنیێتە ناو كارەكە، واتە: هەرچەندە پیێشتر گلەییشی لیێ هەبووبیَ، بەڵام ئیێستا بۆ ئەو كارە چی چاكە و هەقە و ڕاستە، دەبیَ ئەوە بكریَ، نەك لەبەر ئەوەی دوێنیَ قسەیەكی فلانكەسی بە دڵ نەبووە، ڕەوشت و ڕەفتارێكی ئەوی بە دڵ نەبووە، دووری بخاتەوە و، كەسێكی دیكە بهێنیێتە پیێش، تاكو تۆڵەی لیَ بستێنیَ.

بەڵیَ، بەرپرسیارییەتیی و سەركردایەتیی، بە ڕووحی تۆڵەسەندنەوە و، بە دوای تۆڵەدا گەڕان و، لە نێو مێژوودا ژیان، ناكریَ، بۆیە زۆرجار گوتوومە: هۆكارێكی سەرەكیی

شكستهێنانی شیعە لە بەڕێوەبردنی عێراق دا، ئەوەیە كە بە ڕووحی تۆڵە لەگەڵ پێكهاتەكانی دیكەی عێراقدا مامەڵەیان كرد، بەتایبەتی لەگەڵ عەرەبی سوننەدا، هەروەها خۆشیان لە نێوخۆیاندا هەندێك لەگەڵ هەندێكیان، وەك پێغەمبەر (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سەركردایەتیی و مشوورخۆریی دەكرێت، بۆ نموونە: كاتێك قورەیشییەكانی لە مزگەوتی حەرامدا كۆكردنەوە فەرمووی: (ما ترون أني فاعل بكم؟) پێتان وایە چیتان لێ دەكەم؟ ئەوانیش گوتیان: (خيراً أخ كريم وابن أخ كريم) چاكەت لێ چاوەڕێ دەكەین، برایەكی بەڕێز و برازایەكی بەڕێزی، فەرمووی: (اذهبوا فأنتم الطلقاء)[1] دەبڕۆن ئێوە ئازادن، ئازادن بەو واتایە نا، كە ئەوان كۆیلە بوون، یانی سەربەستن، چونكە مسوڵمان نەبوون، یانی: بڕۆن خۆتان سەربەستن.

٦- ماڵ وەسەریەك نان و كاسبیی كردن:

ئەمەش بۆ كەسی سەركردە خەسڵەتێكی زۆر خراپەو، دەبێ زۆر لێی وریا بێ، لە پەنای بەرپرسیاریەتییەكەی و، لە پەنای پۆستەكەی و، لە پەنای ئەو كارەدا، كە پێی سپێردراوە كاسبیی نەكات، عومەری كوڕی خەتتاب (خوای لێ ڕازی بێ)

١) السيرة النبوية لابن هشام، ج٤، ص٢٣٤، ط١/٢٠٠٦، دار ابن الهيثم.

هەندێك لەو كەسانەی دەیكردن بە والی، ئەگەر زانیبای كەسێكیان دەوڵەمەند بووە و كاسبیی كردوە و سەروەتەكەی زیاتر بووە، ماڵ و سەروەتەكەی لێدەساند، هەیانبوو لەگەڵی بەش دەكرد و نیوەی دەخستەوە (بيت المال)، كەسێكیش كاسبییەكەی زیانی بە كارەكەی نەگەیەندبایە، بۆ خۆی كاسبیی دەكا و خۆی دەژیەنێ، ئەوە شتێكی دیكەیە.

٧- لەدەستدانی دەرفەت بەهۆی ترسەوە:

سەركردە دەبێ ئازا بێ، یەكێك لە سیفەتەكانی سەركردە، كە باسمان كردن، ئازایەتیی و بوێرییە، نەترسان و نەسڵەمینەوەیە، دەبێ سەركردە وریا بێ، بەهۆی ترسەوە دەرفەت لە دەست نەدات، ئێمە كاتی خۆی كە كۆمەڵی ئیسلامییمان ڕاگەیاند، دوای ئەوەی كە گەیشتبووینە بنبەست، یان دەبوو ئاشت بەتاڵیی لێ بكەین و هەر كەسێك بچێتەوە ماڵی خۆی، یان دەبوو ئەو بڕیارە بدەین و كۆمەڵی ئیسلامیی ڕابگەیەنین، ئەوەبوو كۆمەڵی ئیسلامییمان ڕاگەیاند و پشتمان بە خوای بێ هاوتا بەست، ئێستاش هەر هەنگاوێك بێتە پێشمان، بەرژەوەندیی خەڵك و كۆمەڵگامانی تێدا ببینین، بوێریی و ئازایەتیی ئەوەمان هەیە، بڕیاری لێ دەدەین و خۆمانی پێ دادەین، خوا پشتیوان بێ.

٨- دەمارگیریی و زبریی:

ئەمەش خەسڵەتێکی زۆر خراپەو، سەرکردە دەبێ خۆی لێ بپارێزێ، نابێ دەمارگیر بێ بۆ بیروبۆچوونی خۆی، بۆ مەزهەبێکی دیاریکراو، بۆ قوتابخانەیەکی دیاریکراو، بۆ شارێك، بۆ شوێنێك، بۆ خەڵکێك، بۆ کەسێك، چونکە دەمارگیریی(تَعَصُّب) ئەوەیە، لەسەر بناغەیەکی ناهەق، توند دەست بە شتێکەوە بگری، پێچەوانەی دەمارگیریی بریتییە لە لێبووردەیی و دڵگەورەیی و دڵفراوانیی، هەروەها دەبێ سەرکردە خۆی لە زبریی بپارێزێ، لە قسەی زبر و هەڵسوکەوتی زبر، مەگەر لە شوێنی خۆی دا، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٩﴾التحريم (٩)

واتە: ئەی پێغەمبەر! لە دژی کافر و مونافیقەکان تێبکۆشە و زبریش بە لەسەریان.

کەواتە: لە شوێنی خۆیدا زبریی هەیە، بەڵام سەرکردە دەبێ زیاتر نەرم و نیان و هێمن و مەند بێ، بەڵام ئەگەر خراپە و لادان و تاوان و ناڕێکییەکی بینی، دیارە بەئەندازەی ئەوە کە پێویست دەکات، دەبێ لە بەرامبەریدا زبر بێت بۆ لابردنی و ڕووبەڕووبوونەوەی.

٩- هەڵبژاردنی کەسانی بێ هێز لەبەر تەسلیم بوونیان:

سەرکردە دەبێ وریا بێت، نەفس و شەیتان فیڵی لێ نەکەن، بۆ نموونە: فلاَنکەس لەگەڵ تۆدا زۆر ڕێك و گونجاوە، یان فلاَنکەس هەرچی پێی بڵێی: ناڵێ نەخێر، ئنجا ئایا کەسی ئاوا باشە؟! نەخێر، بێگومان باش نیە، بەلاَم ئەگەر قسەیەکی هەقت گوت و ئەویش نەیگوت: نەخێر، ئەوەیان باشە، بەلاَم ئایا هەر بەوەندە هەرچی تۆ گوتت بڵێ: بەڵێ و بە هیچ قسەیەك و ڕایەکت نەڵێ: نەخێر، لەبەر ئەوەی قەناعەتی وایە کە تۆ هەقی، ئایا ئەوەندە بەسە بۆ ئەوەی تۆ کارێکی پێ بسپێری؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر، بەڵکو دەبێ تەماشا بکەی: ئایا هێز و شایستەیی ئەو کارەی پێی دەسپێری، تێیدایە یان نا؟ ئەگەر هێز و توانا و شایستەیی بەڕێوەبردنی ئەو کارەی نەبێ، با لەگەڵ تۆشدا گونجاو بێ و، با بۆ بۆچوونەکانی تۆش ەڵێ بکا و، متمانەی تۆ بێ، بەلاَم ئەگەر توانا و شایستەیی ڕاپەڕاندنی ئەو کارەی نەبێ، دوایی لە ئەنجامی ئەو کار پێسپێردرانەدا عەیبدار و ناشیرین دەبێ و، شکست دەخوا و سەرەنجام تۆش پێی ناشیرین دەبی.

١٠- ڕوون و ڕاشکاونەبوون:

ڕوون و ڕاشکاونەبوون، خەسڵەتێکی زۆر خراپە بۆ بەرپرس و سەرکردە، پێشتر ئاماژمان پێدا کە یەکێك لە خەسڵەتەکانی کەسی سەرکردە، ئەوەیە ڕوون و ڕاشکاو و، بێ قۆرت و پێچ بێ و، بێ گرێ و گۆڵ بێ و، ساغ و ساف بێ، بۆیەش ڕوون و ڕاشکاو نەبوون، یەکێکە لەو خەسڵەتە خراپانەی کە دەبێ سەرکردە خۆییان لێ بپارێزێ.

١١- بە پەلە بڕیاردان بە بێ ساغکردنەوە:

لە ئەزموونی خۆمدا زۆرم بینیوە کە بەرپرسێکی گەورە هەواڵ و زانیارییەکی هەڵەی پێگەیشتوە، ئەویش ئەو هەواڵ و زانیارییە زاندراوە هەڵەیەی پێیگەیشتوە، کردوویەتی بە بناغە بۆ بڕیارێکی گەورە، بەڵام دوایی پەشێمان بۆتەوە، یان خەسارەتێکی گەورەی لێکەوتوە، بۆیە دەبێ بە پەلە بڕیار نەدرێ و، بەبێ ساغ کردنەوە، هیچ زانیاریی و هەواڵێك نەکرێتە بناغەی بڕیاردان، چونکە دوایی پەشێمانیی بەدوادادێت، خوای پەروردگاریش دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ... ﴾ النساء (٩٤). واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات بە زەوییدا ڕۆیشتن، چاوتان وردبکەنەوە و بەرپێی خۆتان ببینن.

١٢- زیاد لە پێویست نەرمیی نواندن لەگەڵ لادەران دا:

ئەمەش خەسڵەتێکی خراپە، لە هەر سەرکردە و بەرپرسێك دا هەبێ، بەڵێ دەبێ بەرپرس و سەرکردەکان میهرەبان و نەرم و نیان بن، بەڵام زیاد لە پێویست نەرمی نواندن، لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە لادەدەن ڕەنگە دوایی ئەو نەرم و میهرەبانییەی ئەو بقۆزرێتەوە و بەهرەی خراپی لێ وەربگیرێ، بۆیە سەرکردە دەبێ لەوە وریا بێ.

١٣- بەردەوام بوون لەسەر هەڵە:

بەرپرس و سەرکردەیەك، کە دەزانێ شتێکی کردوە هەڵەیە، یاخود هەڵوێستێکی نواندوە، دەزانێ کە هەڵەیە، کەچی بۆشی ڕاست دەکەنەوە و ئامۆژگاریی دەکەن و بۆی دەردەخەن، بەڵام هەر لەسەری بەردەوام دەبێ و پێی عەیبە لەسەر ڕایەکەی خۆی بێتە خوارێ، ئەوە بێگومان عەیبەیەکی گەورەیە و خەسڵەتێکی زۆر خراپە، کەسێك دوای ئەوەی بۆی دەردەکەوێ فلان قسەی، فلان هەڵوێستیی، فلان کارەی خراپە و هەڵەیە، کەچی هەر لەسەری بەردەوام دەبێت و، دەستبەرداری نابێ و کەللەڕەقی و عینادیی لەسەر دەنوێنێ، بابایەکی خۆبەزلگرەو فەشەلی زۆری بەسەردێ.

١٤- زمانشڕیی و جنێودان:

خەڵکێکمان بینیوە لە ئیسلامیی و نا ئیسلامیی، زمانی خۆیان بۆ کۆنترۆڵ ناکرێ و، هەرچی هاتە سەر زمانیان دەیڵێن و زمانیان شڕەو، جنێو دەڵێن و، وشەی بێ نەزاکەت بەکاردێنن، هەڵبەتە زمانشڕیی بۆ هەموو بەرپرسێك هەر ناشیرینە، بەڵام بە تایبەتی بۆ بەرپرسێك کە لە چوارچێوەی تەوژمی ئیسلامییدا کار دەکات و، خۆی بە سەرکردەیەکی مسوڵمان دەزانێت، زۆر ناشیرین و نەگونجاو و ناشایستەیە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: (لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِطَعَّانٍ، وَلَا بِلَعَّانٍ، وَلَا الْفَاحِشِ الْبَذِيءِ)[1] واتە: بڕوادار تانە لێ دەر و لەعنەتکەر و زمانشڕ و جنێو فرۆش نیە، پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: بڕوادار ئاوا نیە، چ جای بەرپرسێکی بڕوادار، دەبێ زیاتر لە خۆی وریا بێ.

١٥- داخراویی و دۆگمایی و نەکرانەوە:

بەرپرس نابێ داخراو و دۆگما بێ و، نابێ دەرگا لەسەر خۆی دابخات و، تەنها خۆی ببینێ و تەنها دەوروبەرێکی تەسکی خۆی ببینێ، بەڵکو پێویستە عەقڵی کراوە بێ و،

١) أخرجه أحمد: ٣٨٣٩، حديث صحيح.

چاوی دوور ببینێ و، دڵیشی گەورە بێ بۆ وەرگرتنی پێشنیار و سەرنج و ڕەخنەی خەڵك، بەوە دەتوانێ هەقی زیاتر بداتە ئەو ئەرکەی خراوەتە سەر شانی، کە ئەرکی بەرپرسیاریەتییە.

خوای میهرەبان لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە والێبکات، کە خۆمان لەو خەسڵەتە خراپانە بپارێزین و خۆمان بەو خەسڵەت و ڕەوشتە بەرزو جوانانە برازێنینەوە کە پێشتر باسمان کردن.

## تەوەری دوازدەیەم

# چەند بنەمایەکی قورئانیی
# لە بواری سەرکردایەتییکردن دا

ڕێزان!

لە قورئانی بەرز و بەپێزی خوای پـەروەردگاردا، دەگـونجێ گەلێك بنـەما و بنچـینەی حـوکمڕانیی و سـەرکردایەتیی ڕێـك و ڕاسـت هـەڵبهێنجرێن، بـەڵام حـەوت (٧) بنـەمای سـەرەکییم هەڵهێنجاون، لە چەند ئایەتێکی بە پێزی قورئـان دا، هـەروەها دواتـریش سـەرنجێکی خێـرا دەدەیـن لـە ئایەتـەکانی کۆتـایی سوورەتی (الفرقان) ئایەتەکانی (٦٣-٧٤)، ئەو دوازدە ئایەتـە کە ئاماژە دەکەن، بە پازدە (١٥) لە خەسڵەت و سیفەتەکانی کەسـانێك کـە خـوای کاربـەجێ بـە بەنـدەکانی خـوای خـاوەن ەزەیی پێناسەی کردوون.

## بنەمای یەکەم و دووەم:

## دڵنیایی و خۆڕاگریی (اليقين و الصبر):

دووان لەو خەسڵەتانەی کە لە قورئاندا خراونەڕوو، بۆ کەسانێك کە دەبێ سەرکردایەتیی و پێشەوایەتیی خەڵك بکەن، بریتین لە دڵنیایی(اليقين) و خۆڕاگریی(الصبر)، وەك لە سوورەتی (السجدة) ئایەتی (٢٤)دا خوای بێ هاوەڵ دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾. واتە: ئێمە لە نێو وەچەی ئیسرائیلدا {لە نێو گەلی مووسادا} پێشەوایانێکمان پەیدا کردن و ڕەخساندن، خەڵکیان ڕێنمایی دەکرد بە فەرمانی ئێمە {یان: بە بەرنامەی ئێمە خەڵکیان سەرڕاست دەکرد} بە هۆی ئەوەوە کە خۆڕاگربوون و عادەتیشیان وابوو بڕوایەکی پتەو و زانیارییەکی بێ خڵتەیان بەرامبەر بە ئایەتاکانی ئێمە هەبوو.

زانایان لەم ئایەتە بەپێزەوە ئەو بنچینەیان هەڵهێنجاوە، کە دەڵێت: (بالصبر واليقين تُنالُ الإمامة في الدين)، واتە بە هۆی سەبر و یەقینەوە پێشەوایەتیی لە دینداریییدا، لە ئیسلامەتییدا، دەستەبەر دەبێ.

لێرەدا تۆزێك ئەم دوو سیفەتە شی دەکەینەوە:

أ- مەبەست لە (صبر) بریتیە لە خۆڕاگریی، كە دەفەرمویَ: (لَمَّا صَبَرُواْ) كە خۆیان ڕاگرت، وشەی (صبر) بە كردار (فعل) دێنێت، چونكە مرۆڤ دەبێ بە كردەوە خۆڕاگر بیَ، سەبارەت بە خۆڕاگریی خوای بەرز و مەزن بەركارەكەی قرتاندوە، نەیفەرمووە: (صبروا علی ماذا) لەسەرچی خۆیان ڕاگرتوە، چونكە هەموو ئەو شتانەی پێویستییان بە پشوو درێژیی و خۆڕاگریی هەیە، هەموویان دەگرێتەوە، یانی:

١) خۆیان ڕاگرتوە لەسەر تاعەتی خۆیان، كە ئەنجامی بدەن.

٢) خۆیان ڕاگرتوە لەسەر سەرپێچیی و تاوان، خۆیانی لیَ بە دوور بگرن.

٣) خۆیان ڕاگرتوە لەسەر موسیبەت و بەلاَ، لەبەرامبەریدا چۆك دانەدەن و سكالاَو شەكوا نەكەن بۆ لای دروستكراوەكان و تەنها پەنا بە خوا بگرن.

٤) خۆیان ڕاگرتوە لەسەر هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە خۆیان لە بەرامبەریدا ڕابگیریَ، وەك هەڕەشەی دوژمنان و پیلان و فێڵی ناحەزان.

٥) هەروەها خۆیان ڕاگرتوە لەسەر نەفانیی نەفامان و، لەسەر هەندێك هەڵسوكەوتی نەزانانەی شوێنكەوتووانیان و، خەڵكی دەوروبەریان.

خۆڕاگریی هەموو ئەوانە دەگرێتەوە و گەلێك شتی دیکەش دەگرێتەوە.

- سەبارەت بە (یقین) خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ﴿٢٤﴾﴾ عادەتیان وابوو یەقین و دڵنیاییان هەبوو بەرامبەر بە نیشانەکانی ئێمە، یان بەرامبەر ئایەتە خوێندراوەکانی ئێمە، وشەی (آیات) لە قورئاندا بە لای کەمەوە بۆ سێ واتایان بەکارهاتوە:

١- هەم بە مانای ڕستەکانی فەرمایشتیی خوا دێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا﴾ کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندرێنەوە.

٢- هەروەها بە مانای دیاردە و دیمەنەکانی گەردوون بەکارهاتوە: ﴿وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾﴾.

٣- هەروەها (آیات) بە مانای موعجیزەکانی پێغەمبەرانیش هاتوە: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ﴾ واتە: نۆ موعجیزەی ڕوون و ئاشکرامان بە مووسا دابوون.

بێگومان یەقین هەبوون بە ئایەتەکانی خوا، چ ئایەتە خوێندراوەکانی، چ ئایەتە بینراوەکانی، چ ئایەتە نێردراوەکانی، وەك پاڵپشتیی بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة

والسلام)، یەقین هەبوون، ئەوەیە کە مرۆڤ گەیشتبێتە حاڵەتی دڵ دامەزران و هیچ جۆرە لەرەلەرێکی نەمابێت، ئنجا بەڕاستیی هەر یەقینە کە سەبریش پەیدا دەکات، بەڵام لێرەدا خوای کاربزان سەبری پێشخستوە، ئەگەرنا هەرکات مرۆڤ یەقینی بوو بە خوای بێ وێنەو، بە ئایەتەکانی خواو، بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) و، بە ڕۆژی دوایی و، بە هەموو ئەو شتانەی، کە پێویستە یەقین و بڕوای تەواوی پێیان هەبێ، ئەو کاتە سەبریش لەوێوە سەرچاوە دەگرێ.

## بنەمای سێیەم و چوارەم:

## پاراستن و زانیاریی (الحفظ و العلم)

سێیەم و چوارەم بریتیین لە پاراستن (الحفظ) و زانیاریی (العلم)، ئەویش لە ئایەتەکانی (٥٤) و (٥٥)ی سوورەتی (یوسف)دا هاتوون، دوای ئەوەی پاکیی و بەرائەتیی یوسف ئاشکرا دەبێ، پادشای میسر بەم جۆرە هەڵوێست وەردەگرێ:

﴿وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ﴿٥٤﴾ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴿٥٥﴾﴾

واتە: پادشایەکەی میسر گوتی: بۆم بێنن من ساغی دەکەمەوە خۆم {واتە: دەیکەم بە ڕاوێژکاریی خۆم، یان پشتی پێ دەبەستم بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری وڵاتەکەم}، کاتێک دواندی پێیگوت: تۆ لەلای ئێمە خاوەن پێگەی و ئەمینداریشیی {واتە: متمانە پێکراوی، یوسف (علیه الصلاة والسلام) یش} گوتی: من لەسەر عەمبارەکانی زەویم دابنێ، {بەزاراوەی ئەمڕۆ: بمکە بە وەزیری ئابووریی}، چونکە من دوو سیفەتم تێدا هەن: هەم پارێزەرم و، هەم ئەمینداریشم.

کەواتە: ئەم دووسیفەتەش بۆ هەر کەسێك کارێکی پێ بسپێردرێ، زۆر پێویستن، یەکەم: پاراستنی ئەو کارەی کە

پێی دەسپێردرێ، دووەم: ئەمانەت و زایە نەکردنی و خیانەت و موخەننەتیی تێدا نەکردنی.

ئنجا کە یوسوف دەفەرموێ: من پارێزەر و زاناشم واتە: زانام بەو کارەی پێم دەسپێردرێ و، پارێزەریشم بۆی، زانایی واتە: تێدا بەرچاوڕوونیی و شارەزایی و کارامەیی، پاراستنیشیی ئەوەیە کە کارەکە لەدەستیدا زایە نەبێ و، کەلێنی تێ نەکەوێ.

## بنەمای پێنجەم و شەشەم:

## هێز و دەستپاكیی (القوة و الأمانة)

پێنجەم و شەشەم بریتین لە هێز (القوة) و ئەمینداریی(الأمانة) كە لە ئایەتی ژمارە (٢٦)ی سوورەتی (القصص)دا ئاماژەیان پێكراوە، دوای ئەوەی مووسا (علیه الصلاة والسلام) لەو قاچاغییەی فیرعەون دەربازی دەبیّ و، دەچێت بۆ مەدیەن و، لەویّ پیاوە ساڵحەكەی مەدیەن، كە هەندیّ دەڵێن: شوعەیب بووە، بەلاّم وەك لە تەفسیری سوورەتی (القصص)دا باسم كردوە، ناگونجیّ شوعەیب بووبیّ، چونكە: یەكەم ناوی نەهاتوە، دووەمیش بەلای كەمەوە لە نێوان شوعەیب و مووسادا، چوارسەد تاكو پێنج سەد ساڵ فاسیلە هەیە، كتێبە مێژووەكان وا دەڵێن، هەندێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان زۆر سەرنجی مێژوویان نەداوە، بۆیە هەندێك ڕایان گوتوون، هیچ بەڵگەیان لەسەر نین، چونكە خوای زاناو توانا شوعەیبی ناردوە بۆ لای خەڵكی مەدیەن و، چوونی مووسا بۆ سەرزەمینی مەدیەن و ڕێككەوتنی لەگەڵ ماڵی ئەو پیاوە ساڵحەدا، كە ئەو كچانەی هەبوون، زۆر لە دوای نێردرانی شوعەیب بۆ لای خەڵكی مەدیەن و، دوایی سزادانی خەڵكی مەدیەن، بووە.

ئنجا یەکێك لە دوو کچەکەی ئەو پیاوە ساڵحە، دەڵێ:
﴿ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ ﴿٢٦﴾ ﴾ القصص. واتە: ئەی بابە! بە کرێی بگرە {بۆ شوانیی}، باشترین کەسێك تۆ کرێی بگری، ئەوەیە کە بە هێز بێ و ئەمیندار و دەستپاکیش بێت.

یەکسەر نەیگوتوە: مووسا بەهێز و دەستپاکە، بۆ ئەوەی شتێك نەڵێ، بۆنی ئەوەی لێ بێ، کە ئەو ئافرەتە دەستپێشخەریی دەکات لە شوو کردن دا بەو پیاوە، وەك شەرم و شکۆی ئافرەتانە، بەڵام دەڵێ: باشترین کەسێك کە تۆ بەکرێی بگری بۆ شوانیی، {باسی شوانیی نەکراوە، بەڵام لەوەوە دەزانین، چونکە ئەوان یەکیان لەسەر شوانێك کەوتوە، تاکو ناچار نەبێ کچەکانی بنێرێ بۆ شوانیی}، کەسێکە هەم بەهێز بێ و هەم ئەمینیش بێت، دیارە هێزی مووساش (علیه الصلاة والسلام) لەوەدا دەرکەوتوە، کە بەتەنها ئاژەڵەکانی بۆ ئاوداون، سەبارەت بە ئەمانەتەکەشی، ئافرەت باشتر دەزانێ چ پیاوێك تاکو ڕاددەیەك ئەمانەتی هەیە، یاخود بە پێچەوانەوە خیانەتی هەیە.

کەواتە ئەو دوو سیفەتەش زۆر گرنگ و پێویستن، بۆ هەر کەسێك ئەرکێکی بەرپرسیاریەتیی پێ دەسپێردرێ، دەبێ

بــەهێز بــێ بــۆ ئەنجامــدانیی ئــەو کــارە و، دەبــێ ئــەمین و دەستپاکیش بێ و، فێڵ و موخەننەتیی لەو کارەیدا نەکات.

## بنەمای حەوتەم:

## پارێزکاریی (التقوی)

بنەمایەکی دیکەی قورئانیی، کە خراوەتەڕوو بۆ کەسانێك، کــە ســـەرکردایەتیی دەکــەن و ئیمامــەتیی و پێشـــەوایەتیی دەکەن، بریتیە لە پارێزکاریی (التقوی)، پارێزکاریی سیفەتێك وەك زانایان گوتوویانە: (جماع خصال الخیر کلها) کۆکەرەوەی هەموو سیفەتە باشەکانە، چونکە پێشتر گوتمان تـەقوا بریتیـە لەوەی مرۆڤ خۆی بپارێزێ لە هەر شتێك خوا پێی ناخۆش بێ، خــواش پێــی ناخۆشــە ئەرکــەکانی، کــە پێویســتی کــردوون، بیانچوێنی و، شــتەکان، کــە قەدەغــەی کــردوون، بیانشــکێنی، مــرۆڤیش ئەگــەر خــۆی پاراســت لــە چــواندنی ئەرکــەکان و شــکاندنی قەدەغــەکان، مانــای وایــە ڕێــك بــە شــەریعەتەوە پابەنــدە، بــە هــەردوو بــاری خۆپاراســتن لــە قەدەغــەکان و، ئەنجامــدانی ئەرکــەکانیش دا، ئەمــەش لــە ئایــەتی (٨٣) لــە ســوورەتی (القصــص) وەرمــان گرتــوە، کــە خــوا دەفــەرموێ:

﴿تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ[1] نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾﴾ القصص.

دەفەرمویٚ: ئەم مەنزلگای كۆتاییە بۆ كەسانێكی دادەنێین، كە نە بەرزییان دەویٚ لەسەر زەویداو، نـە تێكدانیشیان دەویٚ و، سەرەنجامیش بۆ پارێزكارانە.

كەواتە: ئەوانەی پارێزكارن، نایانەویٚ خۆیان بەسەر خەڵكدا بسەپێنن و، ناشیانەویٚ تێكدان و خراپەكاریی بكەن.

جێی سەرنج ئەوەیە، كە لـەم سـوورەتی (القصـص)دا، لـە سەرەتاوە خوای پەروەردگار باسی مووسـا (علیه الصلاة والسلام) و فیرعەون دەكات و دەفەرمویٚ:

﴿نَتْلُوا عَلَيْكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرْعَوْنَ بِٱلْحَقِّ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾﴾ القصص.

---

١) ڕۆژی دوایی بۆچی پێی دەگوترێ: (آخرة)؟ چونكە كۆتاییەو، لە دوای ڕۆژی دوایی، ڕۆژێكی دیكە نایەت، دنیاش (مؤنث)ی (أدنی)یە، یانی: (أقرب)، دنیا لێمان نزیكە، بەڵام (آخرة) لێمان دوورە، لە دوای قۆناغی دنیا، بەرزەخ دێت، لە دوای بەرزەخ، قۆناغی ئاخیرزەمان (ساعة) دێ، دوای ئەویش قیامەت دێت، دوایی چوونە بەهەشت و چوونە دۆزەخ دێ، كە مەنزلگای كۆتایین.

واتە: لە بەسەرهاتی مووسا و فیرعەونت بەڕاستیی بەسەردا دەخوێنینەوە، بۆ کۆمەڵێك بڕوا بێنن، بێگومان فیرعەون خۆی سەپاند بەسەر زەمین{ی میسر}دا و خەڵکەکەی بەش بەش کرد، هەندێکی دەچەوساندنەوە {سۆغرە و بێگاری پێ دەکردن کە بەنی ئیسرائیل بوون}، نێرینەکانی سەر دەبڕین و مێیینەکانی دەهێشتنەوە، بەڕاستیی ئەو لە تێکدەران و خراپەکاران بوو.

لە کۆتایی سووڕەتی (القصص)یشدا، خوای دادگەر دەفەرموێ: ئەم مەنزڵگای کۆتاییە بۆ کەسانێکی دادەنێین، کە لە زەویدا نایانەوێ خۆیان بسەپێنن و خۆیان بەرز بکەنەوە بە ناهەق، ئەگەر خەڵك بەرزیان بکاتەوە و هەڵیانبژێرێ و، خەڵك بەقەناعەتی ئازادانەی لە پشتیانەوە بڕوا و پشتیان بگرێ بە هەق و پۆست و مەقامێك وەربگرن بۆ خزمەتی خەڵك، هیچ تۆز وخۆڵ (غُبار)ێکی لەسەر نییە، بەڵام بە ناهەق خۆیان بسەپێنن بە حوکمی عەسکەرتاریی و، بە حوکمی بنەماڵەیی، بە حوکمی ئەوەی کە پارەی حەرامیان بە دەستەوەیەو، بە حوکمی ئەوەی دەسەلاتێکی نارەوایان هەیە، سەرەنجام ئەو شێوە حوکمڕانیی و خۆ بەرزکردنەوەیەی ئەوان چی لێ پەیدا دەبێ؟ تێکدان و خراپەکاریی (فساد)ی لێ پەیدا دەبێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەم مەنزڵگای کۆتاییە بۆ کەسانێك دادەنێین، کە

نایەنـــەویٚ لەســـەر زەوی خۆیـــان بـــەرز بكەنـــەوە و، خۆیـــان پسەپێنن و، تێكدان و خراپەكارییشیان ناویٚ و، سەرەنجامیش بۆ پارێزكارانە.

كەواتـــە: ئـــەوەی پارێزكـــار بێـــت، دوور دەبێـــت لـــە خـــۆ فـــەرزكردن بەســـەر خـــەڵك داو، لـــە تێكـــدان و خراپـــەكاریی لـــە زەویدا.

## پازده سیفەتی گەورەو گرنگی سەركردایەتییكردن لە كۆتایی سوورەتی (الفرقان)دا:

ئێستاش با خێرا چاوێك بخشێنین بـەو دوازده (١٢) ئایـەتی كۆتـایی سـوورەتی (الفرقـان)دا، خـوای كاربـەجیٚ لـە كۆتـایی سوورەتی (الفرقان)دا پێناسەی بەندەكانی خۆیمان بۆ دەكات، پازده (١٥) سیفەت، بۆیەش ئـەو ئایەتانـەمان هەڵبـژاردوون بـۆ مەبەسـتی نـاوبراو، چـونكە لـە كۆتاییـدا خاوەنـانی ئـەو سیفەتانە، لـە خـوا دەپاڕێنـەوەو دەڵـێن: ﴿وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ بمانكـە بـە پێشـەوا بـۆ پارێزكـاران، كەواتـە: كەسـانێك شایستەیی پێشەوایەتیی پارێزكارانیان هەیە، كە خـاوەنی ئـەو پازده سیفاتانە بن:

**سیفەتی یەكەم:** سەرەتا خوا دەفەرمویَ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا ﴾ بەندەكانی {خوای} بەبەزەیی ئەوانەن، كە بە ئارامی بەڕیدا دەڕۆن.

خوای میهرەبان لە كوێوە دەست پیّ دەكات؟ عادەتی قورئان و فەرمایشتی خوا وایە، كە پێناسەی شتەكان دەكات، لە حاڵەتی كردەیی دا پێناسەیان دەكات، نەك پێناسەیەكی تیۆریی (نظري)، یانی: ئەگەر تۆ تەماشای بەندەكانی خوای خاوەن بەزەیی بكەی، ڕۆیشتنیان سەرنج بدەی، بە هێمنیی و ویقار و ڕێز و حورمەتەوە بە ڕێدا دەڕۆن، ئەوە جۆری ڕۆیشتنیانە.

**سیفەتی دووەم:** ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾﴾. كاتێك نەفامان بیاندوێنن، دەڵێن: سەلام.

واتە: سەلامتان لیّ بیّ، بڕۆن خواتان لەگەڵ، یاخود: قسەیەكی سەلامەت دەكەن و لەگەڵیان ناچنە تەرازووەوە، لەگەڵیان پێوەناچن و، خۆیان لەگەڵیان دا هاوئاست ناكەن.

**سیفەتی سێیەم:** ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾﴾ بەندەكانی {خوای} بەبەزەیی كە شایستەی ئەوەن، دوایی خوا ئەركی ئیمامەتیان پیّ بسپێریّ، ئەوانەن لە

شەوگاردا دەمێننەوە بە كڕنووش بردوویی و بە ڕاوەستاویی، واتە: نوێژكەری باشن و شەونوێژ دەكەن.

**سیفەتی چوارەم:** ئنجا ئایا كە شەونوێژ دەكەن، لە خۆیان بایی دەبن؟ نەخێر: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ ۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾﴾ ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان! سزای دۆزەخمان لێ لابدە، چونكە سزایەكەی پەیوەستە و لە كۆڵ مرۆڤ نابێتەوە، ﴿إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾﴾. دۆزەخ خراپترین شوێنە، كە نشینگەی بەردەوام بێ، یان نشینگەیەكی كاتییش بێ، یەكێك لە زانا و عاریفەكان دەڵێ: خواپەرستیی شەوییانە، ڕەوشتی ڕۆژێی وا جوان كردوون.

**سیفەتی پێنجەم:** ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾﴾ بەندەكانی {خوای} بەزەیی ئەوانەن، كە كاتێك دەبەخشن، نە زێدەڕۆیی دەكەن و نە چرووكیی و ڕژدییش، حاڵەتێكی میانجیی ڕەچاو دەكەن، واتە: نە دەستبڵاون و نە چنگ قووچاون، بەڵكو بەو شێوەیە دەبەخشن كە شەریعەت فەرمانی پێكردوون، وەك زۆرجاران گوتوومە و دەیڵێم: ئێمە دەبێ شەرعڕەو بین، نە توندڕەو بین نە نەرمڕەو بین، چونكە شەرع جاری وا هەیە دەڵێ: توندبە،

ئنجا دەبێ لەو شوێنەی شەرع دەڵێ: توند بە، توند بی، هەروەها شەرع جاری وا هەیە دەڵێ: نەرم بە، دەبێ تۆش نەرم بی، شەرع جاری وا هەیە دەڵێ: ببەخشە و، جاری وا هەیە دەڵێ: مەبەخشە.

ئەو پێغەمبەرەی (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کە خوا ناردوویەتی بەزەیی بێت بۆ هەموو جیهانییان: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء. لە دوو ئایەت لە سوورەتی (التوبة) و سوورەتی (التحريم)دا، خوای پەروەردگار پێی دەفەرموێ: ﴿جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ﴾[1]، دژی کافر و مونافیقەکان تێبکۆشە و زبر بە لەسەریان، کەواتە: زبرییش لە شوێنی خۆیدا، پێویستە هەروەك چۆن نەرمیی و حەلیمیی لە شوێنی خۆیدا پێویستە.

**سیفەتی شەشەم:** ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ هەروەها ئەوانەی لەگەڵ خوادا لە هیچ شتێکی دیکە ناپاڕێنەوەو، خۆیان لە شیرك دەپارێزن، بە گەورە و بچووکییەوەو، بە پەنهان و ئاشکرایەوە.

**سیفەتی حەوتەم:** ﴿وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾، ئەوانەی ئەو نەفسەی خوا قەدەغەی کردوە، بە

---

١) التوبة ٧٣، التحريم ٩.

هــەقی خــۆی نــەبیّ، نــایكوژن، كەواتــە: فــەقیر حالّۆكــە و مردەلۆخــە و بەســتەزمانۆكە نــین، بــە هــەق ئامــادەن خــەلّك بكوژن، چونكە خوا لە چەند شوێن لـە قورئـان دا، كـە باسـی كوشتن دەكات، دەفەرموێ: بە هەق نەبێ نایكوژن، یانی: بـە هــەق ئامــادەن جــەنگ و كوشــتار بكــەن، وەك پێغەمبــەر محمد(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلم ).

**ســـیفەتی هەشـــتەم:** ﴿وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾﴾، هەروەها ئەوانەی زیناش ناكەن {كە دەفەرموێ: قەتلْ ناكـەن و، زینـا ناكـەن و، شـیرك ناكـەن، واتـە: خۆیـان لـە پێشەكییەكانی ئەوانەش دەپارێزن}، هەر كەسێك، هەر كامێك لەوانـە بكـات، تووشـی گونـاح بـووە، واتـە: دەبـێ چـاوەڕێی سزایەكیش بكات لەسەر ئەو گوناحە.

**ســیفەتەكانی نۆیــەم و دەیــەم و یازدەیــەم:** ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾﴾ جگە لەوانەی كە دەگەڕێنەوەو، ئیمان دێنن {لـە شـیرك و كـوفرەوە دێنــەوە نێـو ئیمـان} و، كـردەوەی بـاش دەكەن:

أ- لە تاوان و سەرپێچییەوە، تەوبەكردن.

ب- ئیمان هێنان.

ج- کرداری باش کردن.

ئەمەش سێ سیفەتی دیکە.

**سیفەتی دوازدەیەم:** ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا ﴿٧٢﴾﴾، هەروەها ئەوانەی ئامادەی مەجلیسی گوناح نابن و، کاتێک بەلای قسەی پووچ و کرداری پووچدا ڕادەبرن، بە حورمەت و ڕێزەوە ڕادەبرن، خۆیان تێکەڵ ناکەن.

**سیفەتی سێزدەیەم:** ﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾﴾ هەروەها ئەوانەی کاتێک ئایەتەکانی خوایان دەخێنرێنەوە بیر، {چ ئایەتە خوێنراوەکان، چ ئایەتە بینراوەکان، چ ئایەتە نێرراوەکان، موعجیزەکانی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)، چ ئەو بەلاًیانەی کە خوای دادگەر بەسەر گەلە یاخییەکانی هێناون، وشەی ئایەت لە قورئاندا بەو چوار واتایە دێت}، کاتێک ئایەتەکانی خوایان دەخرێنەوە بیر، لەپەوڕوو ناکەون لە بەرامبەر ئایەتەکان دا، بە کەڕیی و بە کوێریی، واتە: وانیە کە هەستی بیستن و دیتنی خۆیان لە دەست دابێت، لە بەرامبەر ئایەتەکان دا، بەڵکو بە گوێیەکی کراوەوە، گوێ بۆ ئایەتە خوێنراوەکان دەگرن و، بە چاوێکی کراوەش تەماشای ئایەتە بینراوەکان دەکەن.

**سیفەتی چواردەیەم:** ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ **هەروەها** ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان! لە هاوسەرانمان و لە وەچەمان، مایەی دڵخۆشییمان پێ ببەخشە، واتە: خوایە! تەوفیقمان بدە، خێزان و منداڵ و وەچەمان وا بن، مایەی دڵخۆشییمان بن، مایەی شادییمان بن، سەرمان پێیان بەرز بێ و، دڵمان پێیان خۆش بێت.

کەواتە: کەسانێك شایستەی ئەوە بن، ببنە پێشەوای خەڵك، دەبێ ئاگایان لە ماڵ و منداڵی خۆشیان بێ و، باش پەروەردەیان بکەن و، وایان لێبکەن پێیان سەربەرز و دڵخۆش بن، ئەویش بەوە دەبێ کە دەبێ کاتیان بۆ تەرخان بکەن و گرنگیی و بایەخیان پێبدەن.

**سیفەتی پازدەیەم:** دوای ئەوەی دەڵێن: پەروەردگارمان! لە ماڵ و منداڵمان مایەی دڵخۆشیی و شادمانییمان پێ ببەخشە، دواتر دەڵێن: ﴿وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾ ئەمە کۆتا پاڕانەوەیانە و کۆتا سیفەتییانە، خوایە بشمانگێڕە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران.

کەواتە کەسێك شایستەی ئەوەیە ببێتە پێشەواو سەرکردە بۆ پارێزکاران، کە خاوەنی ئەو پازدە (١٥) سیفەتە بێت، هەر لە چۆنیەتیی بەڕێدا ڕۆیشتنیانەوەو، قسە و وتووێژکردنیانەوە

بگرە، هەتا شەونوێژ و خواپەرستییان و، بوغرا نەبوونیان بە هۆی تاعەتییانەوە، هەروەها پاڕانەوەیان لە خوا، كە لە سزای دۆزەخ بیانپارێزێ، ئنجا شێوەی ماڵ بەخشینیان، كە ماڵ بەخشین مانای ئەوەیە: كاسبكاری باشن، چونكە كەسێك دەتوانێ ببەخشێ، كە كاسبكار و هەبوو بێ، هەروەها خۆپاراستنیان لە شیرك شیركی گەورە و گچكەو، خۆپاراستنیان لە كوشتن، كوشتنی بەناهەق و، زینا و داوێن پیسی، هەروەها پێشەكییەكانی ئەو گوناهانە، هەروەها كە تووشی ئەو گوناهانەش بوون، تەوبە دەكەن و، بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە و، ئیمان دێنن و، كردەوی باش دەكەن، دیسان خۆیان دەپارێزن لە بەشداربوون لە كۆڕ و مەجلیسی گوناهو تاوان و، خۆیان دەپارێزن لە قسەی پووچ و كرداری پووچ و، كە بەلاشیاندا ڕەت دەبن، بە حورمەت و ڕێزەوە ڕەت دەبن و، ئنجا لە كۆتاییدا ڕووی ئەوەیان هەیە ڵێن: خوایە! لە ماڵ و منداڵمان دا مایەی دڵخۆشیی و شادییمان پێ ببەخشە و، بمانگێڕە بە پێشەوا بۆ پارێزكاران، كەواتە: كەسانێك شایستەی ئەوەن، پێشەوای پارێزكاران بن، كە ڕازاوەبن بەو پازدە (١٥) سیفەتانەی باسمان كردن.

خوشك و برا بەڕێز و خۆشەويستەكانم!

ئەگەر بمەوێ باسی ئەزموونی خۆم بكەم لە بواری سەركردايەتييكردندا، لە چوارچێوەی تەوەرەيەكی ئاوا مەودا بەرتەسكدا، لێنابمەوە، بەڵام وەك چۆن لە هەموو بابەتەكان دا كە خستوومنەڕوو، پوختە و شيلە و گوشراوەكەم خستۆتەڕوو و، ڕوونكردنەوە و لێكدانەوەكەشيم بۆ خوێنەران جێم هێشتوە، لێرەشدا هەر وادەكەم.

وەك دەستپێكی ئەم بابەتەش دەڵێم: ئەزموونی سەركردايەتيی خۆم وەك وەبيرم بێ، لەو كاتەوە دەست پێدەكات[1] كە فەرماندەی هێزی هەمزە بووم و، دواتر كە بوومە ئەندامی سەركردايەتيی لە بزووتنەوەی ئيسلاميی پێشوودا و، دواتر كە بوومە ئەندامی مەكتەبی سياسيی و، هەموو ئەو قۆناغانەی بڕيومانن، تاكو دوايی كە لە ٢٠٠١/٥/٣١ ئەميری كۆمەڵی ئيسلاميی هەڵبژێردرام و تاكو ئێستا و، لە پێش ئەوەشدا، چونكە بەندە يەكێك لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی پەيوەنديی ئيسلاميی بووم، بەڵێ ئەوكاتە بەرپرسياريەتييەكی كردەييم نەبوو، بەڵام هەڵسوكەوتم لەگەڵ ئەو جموجۆڵە ئيسلامييە نهێنييەدا هەبوو و، دوو جاريش بە

---

١) لەساڵی ١٩٨٧ز بەملاوەو، لەبناری قەنديل گوندی قەڵاتووكان.

نوێنەرایەتیی ئەوان چووم بۆ ئێران، بۆ لای هەندێك كەسایەتیی، كە ئەوكات لەوێ پەنابەر بوون.

ئنجا كە باسی ئەزموونی خۆم دەكەم، كەم و زۆر، ئەو سیفەتانەی سەركردەییم لە خۆمدا هەستم پێكردوون، هەرچەندە جۆرێك لە سەغڵەتیی (حرج)یشی تێدا هەیە، كە باسیان دەكەم، بەڵام بە پێویستیی دەزانم، وەك دڵسۆزییەك بۆ خوێنەران لە برایان و خوشكان، زۆر جار یەكێك لێم دەپرسێ: مامۆستا! تۆ چۆن پێگەیشتووی و، چیت كردوە و، چۆنت كردوەو، چۆن فریای ئەو هەموو كتێب نووسینە كەوتووی و، ئەو هەموو كار و چالاكیی و ئەو هەموو هەڵس و كەوتانەت چۆن ئەنجام داون و، لەگەڵ ماڵ و منداڵت دا چی دەكەی و، لەگەڵ خەڵكی دا چی دەكەی و چۆن دەكەی؟!

بۆیە لە هەر دەرفەتێكدا، كە بۆم هەڵكەوێ، بە باش و بگرە پێویستی دەزانم، لە ئەزموونی خۆم ئەوەی پێی گەیشتووم، براو خوشكانی خۆمی بخەمەڕوو.

كەواتە: هەرچی لێرەدا دەیخەمەڕوو: ئەوەیە كە خۆم ەكردەوە و ئەزموون پێیگەیشتووم و، هەموو جارێ پێویست ناكات دووبارەی بكەمەوە.

ئنجـا ئـەوەی دەمـەوێ وەك ئـەزموونی خـۆم لـە بـواری سەرکردایەتییکردن دا بۆ خوێنەرانی بخەمـەڕوو، بیسـت و یـەك (٢١) خاڵە:

١- ناوی خوا لە کار هێنان و، بە هاندەری ڕازییکردنی خوا کەوتنە کارکردن :

زۆر گرنگـە لـە سـەرکردایەتییکردندا، مـرۆڤ نـاوی خـوا لـە کارەکەی بهێنێ و، بە هاندەری ڕازیـی کردنـی خـوای مـەزن و، بەرز ڕاگرتنی بەیداغ و ئاڵای ئایین و بەرنامەکەی بکەوێتـە کـار و، دڵ و دەروونی خۆیشی پاك و خـاوێن بکاتـەوە، لـە هەرچـی هانـدەری دیکــە هەیــە، وەك ڕق هەڵســان لــەم و لــەو و تۆڵەسەندنەوە و، خۆهەڵکێشان بەسەر خەڵکدا و، دەوری خـۆ قــەڕەباڵغ کــردن و...هتــد، ئــەوەی کــە دێتــە یــادم، وەك نیعمـەتێکی خـوا باسـی دەکـەم، لـە سـەرەتای دەسـتبەکار بوونمەوە بەو شێوەیە کارم کردوە، خـوای پـەروەردگاریش لـە نیعمەتی ئیخلاس و خوا پێ مەبەست بوون، بۆ هەموو لایەکمان زیـاد بکـات، چـونکە بێگومـان ئیخلاسـیش پلـە پلەیـە، کـارو چـالاکیی خـۆ بـۆ خـوا سـاغکردنەوە (إخلاص)یـش هــەناو و هەوێنـەو، بـەبێ ئـەوە نـە پیـت و پیـزی دنیـایی و، نـە خێـر و پاداشــــتی قیامــــەتیی نــــابێ: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ﴾المائدة٢٧. واتە: بێگومـان خـوا تـەنیا لـە پارێزکـاران

وەردەگریّ. پاریّزکاریش (متّقي) بەبیّ خۆپاراستن لە شیرك و ڕیا و بیدعەت و لادان و داهیّنان بەپاریّزکار دانانریّ.

٢- بەکردەوە لە خۆدا بەرجەستەکردنی ئیمان و تەقوا و خوا پەرستیی و تەزکیە و ڕەوشتی بەرز:

پیّویستە بە کردەوە مرۆڤ، ئیمان و ئیسلام و تەقوا و خوا پەرستیی و تەزکیە، لە خۆیدا بەرجەستە بکات، بەڕاستیی زمانی کردەوە، زمانیّکی زۆر فەسیح و گۆیایە، هەموو کەس لیّی تیّ دەگات، ئەگەر سەد وتار بدەی لەسەر دنیا کەمگرتن(زهد)، وەك ئەوە نیە، کە خۆت دنیا کەم بگری، دنیا بەکەم گرتنیش ئەوە نیە، کە هیچت لە گیرفان دا نەبیّ و دەستت خالّیی بیّ، بەلّکو ئەوەیە دلّت بە دنیاوە پەیوەست نەبیّ، وەك لە عەلی کوڕی ئەبوو تالّیب (خوای لیّ ڕازی بیّ) و لە هەندیّك پیاوچاکانی دیکەش گیّڕدراوەتەوە، کە ئاوا پیّناسەی زوهدیان کردوە: (ليس الزّهد أن لا تملك شيئاً، ولكنّ الزّهد ألا يملكك شيء) واتە: زوهد ئەوە نیە تۆ هیچ شتیّکت نەبیّ، بەلّکو زوهد ئەوەیە کە هیچ شتیّك تۆی نەبیّ، واتە تۆ نەبی بەکۆیلەی شتەکان.

هەلّبەتە هەرکام لە: ئیمان، تەقوا، خواپەرستیی، تەزکیە، ڕەوشتی بەرز، پلە پلەن و، مرۆڤ دەبیّ هەولّبدات بەردەوام لە

پێهەڵاچـــوون و کـــامڵبوون دا بـــێ، بـــەهۆی لــــەخۆدا قووڵکردنەوەیانەوە.

٣- دڵسۆزیی و بەزەیی و پەرۆش:

زۆر گرنگە بەرپرس دڵسۆز بێ بۆ هـەموو لایـەك و، بـەزەیی هەبێ و پەرۆشیی هەبێ و، بـە تـەنگـەوە بـوونی هـەبێ، جـاری وایـە هەسـتم پێکـردوە برایـەك، خوشـکێك، تووشـی نسـکۆیەك بووە، تەماشام کردوە هەندێکی دیکە دڵیـان پێیخـۆش بـووە و پێکەنیون، یان جۆرێك لە دڵ ئاسوودەییان بۆ هـاتوە!! مـرۆڤ دەبێ زۆر لە خۆی وریا بێ، بێگومان شـەیتان زەفـەر بـە مـرۆڤ دەبات لەو حاڵەتەدا، ئەگەرنا ئیماندار ئەو کەسەیە بە خۆشـیی ئیمانداران دڵخۆش بێ و، بە نا خۆشییان دڵناخۆش بێت، بەڵام ئەگـەر بـە پێچـەوانەوە: بـە ناخۆشـییان دڵخـۆش بـێ و، بـە خۆشـییان دڵنـاخۆش بـێ، ئـەوە پێچـەوانەی ئەوەیـە، کـە پێغەمبـــەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفــــەرموێ: (لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)[1] واتـە: یـەکێ لـە ئێوە بڕوا ناهێنێ {بڕوای تێر و تەواو} تاکو چی بۆ خۆی حـەز لێیە، ئەوەشی بۆ برایەکەشی {خوشکەکەشی} حەز لێ نەبێ،

---

١) متفق عليه: صحيح البخاري (١٣)، وصحيح مسلم (٤٥).

هەروەها چی بۆ خۆی پێ ناخۆشە، دەبێ بۆ ئەویشی پێ ناخۆش بێ.

٤- بەرنامە دانان و بەرچاوڕوونیی:

زۆر گرنگە كاروچالاكییەك كە ئەنجامی دەدەین لە نێوخەڵك دا، بە بەرنامە و بەرچاوڕوونیی كاری خۆمان بكەین، هەموو ئەوانەی كە لە دامەزراندن و بنیاتنانی كۆمەڵی ئیسلامییدا بەشداربوون، دەزانن دوای ئەوەی هەموو لایەك كۆبوونەوە گوتیان: دەبێ تۆ پێشمان بكەوی و بەرپرسمان بی، زۆر داوام لێ كردن كە یەكێكی دیكە بێ و، منیش لە خزمەتدام، گوتیان: ئەگەر تۆ دەیكەی و ئامادەی باشە، ئەگەرنا با هەر كەس بچێتەوە ماڵی خۆی، چونكە ئەو دۆخەی تێداین، چی دیكە بەرگە ناگرێ و، هیچ كام لە ئێمەش ئەو توانایەمان نیە، یاخود خەڵكەكە متمانەمان پێ ناكات، ئەو كاتەش نەمگوت: باشە، هەڵسام زۆرم بیر كردەوە و بیست و پێنج (٢٥) خاڵم نووسین بەناوی: {بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی}[1]، كە شەرحی لەسەر كراوەو تاكو ئێستا چوار

---

١) دوایی تەرجەمەی عەرەبییش كرا، بەناوونیشانی: (الأصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية)و، سێ چوار جاریش بە عەرەبی چاپكراوە.

جاران چاپ كراوە، گوتم: ئەوانە مەرجەكانی منن و ئاوا لە كاری ئیسلامیی تێكەیشتووم، ئەگەر ئێوەش ئەمانەتان پێ قبوولْن، ئەوە باشە، ئەگەر پێتان قبوولْ نین، بابێین گفتوگۆ بكەین، ئیدی ئەوەبوو یەك دوو ڕۆژ وتووێژ و قسەمان لەسەر كردن و، سەرەنجام هەموو ئەو خالآنەی نووسیبوومن، ئەوانیش لەگەڵ سووك و سەنگییەك و، دەستكاریی هەندێك برگەدا، هەموویان قبوولْیان بوو، واتە: ئەو كارەی خۆمان لەسەر بناغە و بەرنامە و بەرچاوڕوونیەك بووە و دەستییپێكردوە.

٥- ڕاوێژكردنی بەردەوام:

بەردوام مرۆڤ دەبێ ڕاوێژ بكات، بە هەموو ئەوانەی لە دەوریتی، هەر كەسە بەپێی خۆی: ئەنجوومەنی سیاسیی، كە ئێستا وەك ئۆرگانێكی سەرەوەی كۆمەڵی ئیسلامییە و، ئەنجوومەنی سەركردایەتیی، هەروەها ئەوانی دیكەش هەر كەسە لە شوێنی خۆی و، هەر كەسە لە پێگەی خۆی دا.

لە مێژە پەندێك بەكاردێنم، هیوادارم زۆر باش كارم پێیكردبێ: {عاقڵ كەسێكە عەقڵی خەڵك خۆی دەوڵەمەند كات و، زانا كەسێكە بە زانیاریی ئەوانی دیكە خۆی زاناتر كات}.

مەگەر چۆن، ئەگەرنا هیچ کارێکی گرنگم بەبێ ڕاوێژ و پرس و ڕا نەکردوە، تەنانەت وتاردان و نووسین و کۆڕەکانیشم، بەردەوام ڕاوێژم کردوە و، بە هەموولایەکم گوتوە - ئەوانەی لەو بوارەدا ڕاوێژیان پێدەکرێ - : دەمەوێ فلاّن کارە بکەم، ئنجا بێ زەحمەت ڕاتان چییە؟ بیکەم یان نا؟ هەروەها چۆنی بکەم و چی بکەم، لە بیروڕای خۆتان ئاگادارم بکەنەوە.

٦- بەهرە وەرگرتن لە ڕەخنە و پێشنیارەکان:

زۆر جار خوشکێك، برایەك، کەسێك لە نێو کۆمەڵی ئیسلامیی و، لە دەرەوەی کۆمەڵی ئیسلامییش هەیە، پێشنیار دەکات و ڕەخنە دەگرێ و، تێبینی و سەرنج دەخاتەڕوو، ئێمە لێی بەهرەمەند دەبین، چونکە عاقڵ ئەو کەسەیە بە عەقڵی خەڵك خۆی دەوڵەمەند بکات و، زانا ئەو کەسەیە بە زانیاریی خەڵك خۆی دەوڵەمەند بکات، هەر کەسێك ئەوەندە بە خۆی سەرسام بێ و، ئەوەندە لە خۆی ڕازی بێ و، ئەوەندە ڕای خۆی لەلا پەسند بێ، پێی وابێ پێویستیی بە بۆچوون و ڕای کەسێکی دیکە نیە! لە ڕاستییدا بە فەقیریی و بە ئاتاجیی دەمێنێتەوە و، ڕەنگە بەبێمرادییش سەربنێتەوە!

٧- ڕێزگرتن لە ڕای جیاواز:

هەمیشە مرۆڤ دەبێ ئەو گریمانەیە دابنێ، كە خەڵك هەمووی مەرج نیە وەك تۆ بیر بكاتەوە، ڕایان جیاواز دەبێ و بۆچوونیان جیاواز دەبێ و، بەجۆرێكی دیكە تێدەگەن و، لەلایەكی دیكەوە بۆ بابەتەكە دەڕوانن، زۆرجار لەگەڵ ڕای جیاوازدا هەوڵمداوە زۆر بە سینگفراوانیی و بە باخەڵ فەڕاحیی مامەڵە بكەم، جاری وا هەبووە برایەك یان چەند برایەك هەبوون، بۆچوونێكیان هەبووە، زانیومە هەڵەن، بەڵام نەچووم بڵێم: دوور بكەونەوە، بەڵكو سەبرم لەسەر گرتوون، تاكو قەناعەتەكەیان گۆڕاوە، لەو بارەوە چەندان نموونەم لەبەر دەستن، كە كەسێك یان كەسانێك، سەرەتا ڕەخنە و گلەییان لە شتێك یان زیاتر هەبووە، بەڵام دوایی خۆیان قەناعەتیان گۆڕاوە !

بێگومان ڕێز گرتن لە ڕای جیاواز و، بەهرە وەرگرتن لە ڕا جیاوازەكان، مەرجێكی گرنگە بۆ هەر كەسێك بیەوێ سەركردایەتیی بكات، كە پێم وایە تاكو ڕاددەیەك لەوەدا ئەزموونێكی سەركەوتووم هەبووە و، خوای پەروەردگاریش هەرچی چاكەیەو، هەر كام لە ئێمە كردوویەتی، لە هەمولایەكی قبوول بفەرمووێ و، لە كەموكوڕییەكانمان بمانبوورێ.

٨- بە خۆشخوڵقیی و ڕێزەوە مامەڵە کردن:

پێغەمبـــەری کۆتـــایی (محمـــد) (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلم) دەفـەرموێ: (الكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ)[1] قسـەیەکی چاك و پـاك قسـەیەکی خـۆش خێـر و چـاکەیە، هـەروەها دەفـەرموێ: (تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ)[2] زەردەخەنەت لە ڕووی برا مسوڵمانتدا {هەروەها لە ڕووی خوشکی مسـوڵمانتدا} خێـر و چـاکەیە، زۆر لـە زانایـان کـە باسـی هونـەری سـەرکردایەتیی دەکەن، دەڵێن: سەرکردە نابێ بێ زەردەخەنە بێت، نـابێ بـێ ڕووخۆشیی و قسەی خۆش بێ، بەڵکو دەڵێن: دەبێ یـەکێك لـە سیفەتەکان، کە لە سەرکردەدا هەیە، ئەوەبێ جار جـار قسـەی خۆش بکات، قسەی سوعبەت بکـات و، نوکتەیـەك بگێڕێتـەوە، چونکە ژیـان هـەمووی هـەر بـە جیـددیی بەڕێوە ناچـێ، ژیـان شینە و شـاییە و، گریانـە و پێکەنینـە، هـەورازە و نشـێوە و، هەموو شتێکی تێدایـە، پێغەمبـەری کۆتـایی (محمـد) (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کـە پێشـەنگ و سەرمەشـقی ئێمەیـە، نوکتـەی گێڕاوەتـەوە و، قسـەی خۆشـی کـردوە و، سـوعبەتی کـردوە

١) صحيح البخاري:٢٩٨٩ و مسلم: (١٠٠٩)

٢) أخرجه الترمذي (١٩٥٦)، وابن حبان (٥٢٩)، وابن عدي في ((الكامل في الضعفاء)) (٥/٢٧٥) باختلاف يسير.

لەگـەڵ هـاوەڵان دا، (خوا لێیان ڕازی بێ)، بـەڵام بێگومـان لـە سنووری ئەو ئەدەب و نەزاكـەت و نەجابەتـەدا، كـە شایسـتەی خۆیەتی.

ئەمە هەندێك بە شوێنەوار (أثر)ی دێنن دەڵێ: (أعط كلامـك من المُزْح، بقدر ما تعطـي طعامَك مـن الملـح) واتـە: ئەوەنـدە قسەی خۆش بخەگەڵ قسەكانت {قسـەی خـۆش و سـوعبەت} بایی ئەوەندە كە خـوێ دەخەیـە نێـو خـواردن و چێشـتەكەت، پێشینان گوتوویانە: {هەموو شت بە خۆی و خوێش بە مانا}، قسەی خۆش و زەردەخەنە و گفت و لفتی شیرین، بێگومان بـۆ هـەموو كـەس پێویسـتە، بـە تایبـەت بـۆ بابـای سـەركردە و مشـوورخۆر، بـەڵام بـەبێ تێپەڕانـدن و زێـدەڕۆیی و، لـەكات و شوێنی گونجاوی خۆیشی دا.

٩- پاداشتدانەوەی جۆراوجۆری چاكەكاران:

مرۆڤ دەبێ چاكەی چاكەكاران هەرگیز نادیدە نـەگرێ، هـەر كەسـە بـە پێـی خـۆی، بۆیـە گوتوومـە: پاداشـتدانەوەی جۆراوجـۆر، هەیـە دەسـتێكی لەسـەر شـانی دادەنێـی، هەیـە دیارییەكی بۆ دەنێرێ، هەیە قسەیەكی خۆشی لەگەڵ دەكـەی، هەیـە شـتێكی بـۆ دەنووسـی، هەیـە لـە مەجلیسـێك دا باسـی دەكەی، لە ڕووی خۆی یان پاشملـەی خـۆی، هەیـە نازنـاوێكی

لیّ هەڵدەدەی... بە هەرحاڵ هەر كەسەو بە شێوەی خۆی، پێویستە تەقدیر بكریّ، هەرچەندە ئەوانەی كار بۆخوا دەكەن، ەكی كاری خۆیان لەسەر ئەوە ناخەن، خەڵك چی دەڵیّ؟ چونكە كەسێك كار بۆ خوا بكات، دەڵیّ: ﴿لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ۝٩﴾ الإنسان. واتە: نە پاداشتی ماددییمان لیّتان دەویّ و، نە سوپاس كردنی مەعنەویی، چونكە بۆ خوا كردوومانە، ەڵام پێویستە سەركردە ئاگای لەوە بیّ، كە خەڵك پێویستیی بە هاندان و پاداشتدانەوە و دڵخۆشكردن هەیە.

منیش بە حیسابی خۆم بە پێی توانا و بۆ لوان و، بە ئەندازەی لێوەشاوەیی كەسەكان، ڕەچاوی ئەو بنەمایەم كردوە.

١٠- سزا و سەرزەنشت، بەڵام بە كینە و غەرەزەوە نا:

گومانی تێدانیە وەك چۆن مرۆڤەكان، لەسەر چاكە و كاری خێر، پێویستییان بە پاداشت هەیە، پێویستییان بە ئافەرین لێكردن و بە دڵخۆشكردن هەیە، لەسەر لادان و خراپەش پێویستییان بە سەرنج ڕاكێشان و گلەیی لێكران و سەرزەنشتكران و ڕەخنەلێگیران هەیە، بەڵكو هەیە پێویستیی گویّ ڕاكێشرانیش هەیە، خوای كاربزان و پەروەردگاریش

پاداشت و سزای داناون لـە شـەریعەتەكەی خۆیدا، مرۆڤـەكان وایـان پێویسـتـە، خـوای پـەروەردگار بەهەشـتـی دانـاوە بـۆ چـاكەكاران و، دۆزەخـی دانـاوە بـۆ خراپـەكاران، پێغەمبـەری كۆتـایی (محمـد) (عليه الصلاة والسلام) وەك چـۆن پاداشـتـی هەبووە ئافەرینی هەبووە و دەستخۆشیی هەبووە، بۆ ئەوانـەی چـاكیان كـردوە، كەسـانێكیش كـە لـە لادەر و خراپـەكار و گێرەشێوێن بـوون، سـزای بۆیـان هـەبووە، سـزای جۆراوجۆر، ەڵام بێگومان ئەو سزادانە، نابێ لە بوغز و غەرەز و لە كینـەی دڵەوە بێت و، بۆ بێزاركـردن و بێزرانـدن و نارەحـەتكردن بـێ، واش پەسندە بە كـەمیی بـەكاربهێنرێ و، لـەكاتی ناچاریی دا، بەنـدەش بـە گـوێرەی توانـا وامكـردوە و، هـی وابـووە كـە شایستەی سزادانیش بووە، بۆمان سـووك كـردوە، جـاری واش بـووە كـە سـزای كەسـێك یـان كەسـانێكم داوە، نەمهێشـتـوە، خەڵكی دیكە پێی بزانـێ، ئەگـەر هەڵـە و تاوانەكـەی پـەنهان و تایبەت بووبێ، چونكە ئامـانج لـە سـزادان دا، شـكاندنی بابـای سزادراو نیە و ڕاستكردنەوەیەتی!.

١١- پابەندیی بە مەرجەكانی كارپێكەوە كردنەوە:

هـەر كۆمـەڵێك پێكـەوە كـار بكـەن، كـاری بەكۆمـەڵ و هەرەوەزیی، پێویستە پابەند بن بەو مەرجانەوە، كە لەسەریان

ڕێککـــەوتوون، وەك پێغەمبـــەری كۆتـــایی و ســـەروەرمان فەرموویـەتی: (المسلمون عند شروطهم)[١]، (المسلمون على شروطهم)[٢] بە هەردوو ڕیوایەتان هاتوە، مسوڵمانەكان بـەپێی مەرجـــەكانی خۆیـــانن، ئـــەو مەرجانـــەی كـــە لەســـەریان ڕێككەوتوون، دەبـێ پێیانـەوە پابەنـد بـن، مووسـا (عليه الصلاة والسلام) لەگـەڵ (خضـــر)دا، ئـــەو بەنـــدە چـاكە، كـــە خـــوا زانیارییـــەكی تایبـــەتیی پێـــدابوو، مووســـا دەچـــێ زانیارییـــە تایبەتییەكـەی لـێ فێـر بـێ، بەنـدە چاكەكە مـەرجی لەگەڵـدا دەبەستێ، كە بۆ هیچ شتێك پرسیاری لێ نەكات و ڕەخنەی لێ نەگرێ، هەتا خۆی پێی دەڵێ، دوای ئەوەی مووسا سێ جـاران مەرجەكەی دەشكێنێ، لەبەرئەوەی كارێك دەكات، پێچـەوانەی ئەو شەریعەتەیە، كە مووسا هاتوە، مووسا خـۆی ڕانـاگرێ، دوایـی ئـەو پیـاوە چـاكە پێـی دەڵـێ: ﴿هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ﴾ الكهف (٧٨) واتـە: ئەمـە لێـك جیابوونـەوەی مـن و تۆیـە، تـۆ نەتتوانیوە مەرجەكەی منەوە پابەند بی! لە ڕاستییدا كاری هەرەوەزیی ئەگەر وەفاداریی تێدا نـەبێ بەمەرجەكانـەوە، لێـك بلاویی و پەرتەوازەیی دروست دەبێ، ئەویش دیارە لـە هـەموو كەس پێویستترە كە بەرپرس پابەنـدبێ بـە مەرجەكانـەوە، بـا

---

١) رواه الحاكم وأبو داود عن أبي هريرة رضي الله عنه وهو صحيح.
٢) أخرجه الترمذي: (١٣٥٢) واللفظ له، وابن ماجه: (٢٣٥٣) مختصراً.

هەندێك لەو مەرجانە بە زیانی خۆشی تەواو بن، یان پێچەوانەی ڕا و بۆچوونی ئەویش بن، كە ئێمە لە درێژەی كاروانی كۆمەڵی ئیسلامیی دا، چەندجارێك هەموو ئەو برا و خوشكانەی لە سەركردایەتیی بوون دەزانن، ڕایەك خراوەتە دەنگدانەوە، ڕایەكەی من كەمینە لەگەڵیدا بووە و دەنگی نەهێناوە و، ڕای زۆرینە چەسپیوە، هەروەها لە كۆنگرەكاندا هەندێك پێشنیارم كردوون، بەلاَم دوایی نەچەسپیون، هەرچەندە دوای كۆنگرەش ڕایەكەم پەشێمان بوونەوە، بەلاَم بە هەر حاڵ تازە لە دەستچووە و، پابەند بووین بەو مەرجانەوە، ڕایەكەش لەوانە بووە، كە كەمینە و زۆرینە یەكلایی كراونەوە، لەو شتانەدا كە شوێنی ئیجتیهادن، چونكە ئەگەر دەقی لەسەر بێ، هەموومان بۆی ملكەچین، بەلاَم لەو شتانەدا كە شوێنی ئیجتیهادن، پێغەمبەری كۆتایی (محمد)یش (علیه الصلاة والسلام) هەروای كردوە، كە خستوویەتە دەنگدانەوە، ڕای زۆرینەی تەبەنیی كردوە، بەلاَم ئەگەر دەقی لەبەر دەستدا بووبێ، هەموو لایەك بۆ دەقی وەحیی ملكەچ بوون، هەڵبەتە ڕای دیكەش هەیە، كە كەسی بەرپرس و سەركردە دەبێ ڕاوێژ كات، بەلاَم ڕای زۆرینە پابەندكەر نیە بۆی، بەلاَم پێم وایە ڕایەكەی دیكە سەلامەتترە، كە ئێمە تەبەنییمان كردوە و،

ئــەوەش لــە گرفــت و کێشــە دوورتــرە و، بــۆ دڵڕازیــی کردنــی هەموو لایەکیش ئەوە باشترە.

١٢- خاکییەتیی و میهرەبانیی:

بەرپرس دەبێ خاکیی بێ و، میهرەبان و دڵنەرم و لێبووردە بێ، خاکییەتیی بەعەرەبیی پێی دەڵێن: (التواضع) پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دەفـەرموێ: (وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ للّٰهِ إِلَّا رَفَعَهُ اللّٰهُ)[1] واتـە: هیچ کەسێك لەبەر خوا خـۆی بـە کەم نەگرتوە، مەگەر خوا بەرزی کردۆتەوە، هەر کەسێك لەبەر خوا خۆی نزم بکاتەوە، خوا بەرزی دەکاتــەوە، بـەڵام کەسـێك خۆی بەرز بکاتەوە، خوا نزمـی دەکاتـەوە، بۆیـە لێـرەوە وەك برایەکی دڵسۆز ئامۆژگاریی هــەموو لایــەك دەکــەم، هــەرگیز بــە تەمای ئەوە نەبن کـە بـەهۆی شـێوازی ناشــەرعییەوە، خۆتــان بەرز بکەنەوە، نێوانی خۆت لەگەڵ خوادا ڕاسـت و پـاك و چـاك بکە، خــەڵکیش ئینسـاف و ویـژدانی هەیـە، گریمـان ئەگــەر تــۆ شایســتەی کــارێکیش بــی و، بــە تۆیــان نەســپارد، بێــزار و نارەحەت مەبەو، دڵ لە دڵ مەدە، چونکە کـار پـێ سـپێردران، ئەمانەتــە، وەك پێغەمبــەر (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فەرموویــەتی:

---

١) أخرجه مسلم: (٢٥٨٨).

(وإنَّهَا أَمَانَةٌ، وإنَّهَا يَومَ القِيَامَةِ خِزْيٌ وَنَدَامَةٌ، إلَّا مَن أَخَذَهَا بحَقِّهَا، وَأَدَّى الذي عليه فِيهَا)[1]. واتە: بەرپرسیارییەتی ئەمانەتە و لە ڕۆژی دواییشدا مایەی پەشیمانییە، مەگەر كەسێك بە هەق وەریبگرێ و، ئەو هەقەش كە لە سەریەتی لەو ئەركەدا جێبەجێ بكات، بە هەق وەریبگرێ واتە: پەنا نەباتە بەر فرت و فیلێ و خۆ تێكبەستن و بانگەشەكردن و، خەڵك هەڵخەڵەتاندن و ئەو شێوازانەی كە لە دیموكراسیی ڕۆژئاوادا هەن، خەڵك شكاندن و، خۆ بەرز كردنەوە و، شاخ و باڵی زیاد لە خۆنان، بەڵكو خۆت لە بنەڕەتدا چۆنی، با خەڵك ئاوا بەو شێوەیە بتبینێ، هەروەها بە ئەندازەی ئەوە كە مرۆڤ خۆی بۆ خوا چاك و ساغ دەكات، خوا خۆشەویستیی بۆ دەخاتە دڵی ئیمانداران: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾﴾ مریم. واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و كردەوەی باش دەكەن (خوای) بەزەیی خۆشەویستییان بۆ دەڕەخسێنێ، واتە: لە دڵی ئیمانداران دا، ئنجا ئەگەر ئیماندارانیش پێیان وابوو تۆ ەكەڵكی فلان كارە نایەی، دەبێ سوپاس و دەستخۆشییان لێ بكەی، (أبو ذر الغفاري) (خوای لێ ازی بێ)، داوای بەرپرسیارییەتی دەكات پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) پێی دەفەرموێ: (يا أَبَا ذَرٍّ، إنَّكَ ضَعِيفٌ، وإنَّهَا أَمَانَةٌ،

---

١) أخرجه مسلم: (١٨٢٥).

وإِنَّهَا يَومَ القِيَامَةِ خِزْيٌ وَنَدَامَةٌ)[1] واتە: ئـەی (أبـو ذر)! تـۆ بـێ هێزی و، ئەوەش سپاردەیە و ڕۆژی دواییش مایەی سەرشۆڕیی و پەشێمانییە، ئایا (أبو ذر) لە چیدا بێ هێز بووە؟ لـە خـوا پەرستییدا؟ نەخێر، لە هەقبێژییدا؟ نەخێر، لە دین و تـەقوادا؟ نەخێر، بەڵام دیارە لە کار پێ سپێردران و سەرپەرشـتییکردنی خەڵك دا، بێهێز بووە، بۆیە پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) ئەرکی بەرپرسیارییەتیی پێ نەسپاردوە.

١٣- دووربینیی و ئاینده دیتن:

ئەمەشیان خەسڵەتێکی زۆر گرنگەو، لە ئەزموونیی خۆم دا، زۆرجار هەوڵمداوە: کـە دووربـین بـین و ئایـنـدە ببیـنین و، ورد تەماشـا بکـەین، لـە ڕووی شـوێنەوە: بـەس ئـەو شـوێنەمان لەبەرچاو نەبێ، ئەو شـوێنە جوگرافییـەی کـە تێیـداین، بـەڵکو پێویستە ئەولاتریش ببیـنین، لـە ڕووی کاتیشـەوە: بـەس ئـەو قۆناغە کاتییەمان لەبەرچاو نـەبێ کـە تێیـداین، بـەڵکو دوورتـر ببینین، لە ڕووی خەڵکیشەوە: تەنیا ئـەو خەڵکـەمان لەبەرچـاو نەبێ، کە لە نێویانداین، بەڵکو دەبێ خـەڵکی دیکـەش ببیـنین، بـە ئەنـدازەی ئـەوە، کـە مـرۆڤ فـراوان دەبـینێ، چ لـە ڕووی

---

١) أخرجه مسلم: (١٨٢٥).

جوگرافیی، چ لە ڕووی کات، چ لـە ڕووی خەڵکـەوە، بێگومـان هەنگاوەکانیشی ڕاستتر و باشتر دەبن.

١٤- سینگ فراوانیی و لێبوردەیی:

شـارەزایان گوتوویانـە: (آلـة الرئاسـة سـعة الصَّـدْر) سـینگ فراوانیی ئامرازی سـەرکردایەتییکردنە، بۆیـە سـەرکردایەتیی و مشـوورخۆریی، بـەبێ سـینگ فراوانیـی نـاکرێ و، پێویسـتـە سەرکردە و بەرپرس لێبوردە و سینەفراوان بێ.

مـادام ئـەو سـینگ فراوانیـی و لێبوردەییـە زیـان بـە بەرژەوەندیی گشتیی و شکۆی کارەکە نەگەیـەنێت، ئەگـەرنا مادام بزانی کەسێك کارەکەت لـێ تێك دەدا و، شکۆی دێنێتـە خـوار و درزی تـێ دەخـات، ئەوکاتـە سـینگ فراوانیـی و لێبـوردەیی لەگەڵیـدا، خیانەتـە بـە کارەکـە، بـەڵێ دڵڕاگرتنـی کەسێکە، بەڵام لەسەر حیسابی کۆمەڵێکە، کە ئەوەش مامەڵەو سەودایەکە، قازانج سەری مایەی دەخـوات و، پێشـتریش باسـم کرد کە لە ئەزموونی سەرکردایەتییکردنم دا، پتر لای لێبوردن و چاوپۆشییم گرتوە، مەگەر زانیبم چاوپۆشیی زیانی لە قازانجی زیاترە و، بەرژەوەندیی گشتیی دەخاتە مەترسییەوە.

**١٥- سۆراغكردن و چاوپێداگێڕانەوەی بەردەوام:**

مەرج نیە ئەوەی باسی دەكەم لە هەمووی دا، لە حاڵی خۆم ڕازی بم، كە وەك پێویست بووبم، بەڵام بەهەر حاڵ لە قەدەر ئەو توانا سنووردارەی كە خوای پەروەردگار پێی داوم و، لە قەدەر ئەو ئیشە فراوانانەی هەمن، بێگومان كارو چالاكیی: فیكریی و كۆمەڵایەتیی و بانگەوازیی و پەروەردەیی و سیاسیی، بەندە لە چوارچێوەی كاری حیزبیی دا كورت هەڵنەهاتووەو قەتیس نیەو، زۆر فراوان و هەمەجۆرە، بەتایبەت كاری فیكریی و بانگەوازیی و پەروەردەییم، زۆر بەربڵاوترە لە كار و چالاكییەكانی دیكەشم و، بەشێكی زۆری كتێبەكانم بۆ زمانەكانی: عەرەبیی و فارسیی و توركیی و ئینگلیزییش وەرگێڕراون، بەڵام هەرچۆن بێ، پێم وایە هەوڵمداوە ئەوانە هەموویان بێنمە دی، سۆراغكردن و چاوپێداگێڕانەوە بە كارەكاندا بە ئۆرگانەكاندا بە كەسەكاندا، پێویستە، بێگومان تواناش سنووردارە.

هەر لەسەرەتاوەش، كە ئەو كارەم دەستپێكردوە، هەوڵمداوە زیاتر سەركردە (قائد) بم، نەك بەڕێوەبەر (مدیر) پێشتر باسمان كرد جیاوازیی نێوان سەركردە و بەڕێوەبەر چییە ؟ بەڕێوەبەر لە پشتی مێزێك دادەنیشێ و، كاری ڕۆژانەی خەڵك ڕایی دەكات، بەڵام سەركردە زیاتر سەرپەرشتیی دەكات

و، کۆنترۆڵی بارودۆخەکە دەکات، چونکە مرۆڤ توانایەکی سنووورداری هەیەو، ناتوانێ سەرکردەش بێ و، بەڕێوەبەریش بێ، واتە هەم نەخشە دابنێ و چاودێریی بکات و، ئاگای لە شتی گشتیی بێ و، ئاگای لە وردە ئیشەکانی دیکەش بێت، سروشتی منیش وانیە دەستبخەمە کاروباری هەموو کەسێك و، مکوڕ نیم لەسەر ئەوەی هەموو شتێك بەدەست خۆم بێ، بەڵکو پێم خۆشە کارەکان دابەش بکەم بەسەر بەڕێزانی دیکەدا و، هاوکارەکانم بە مانای وشە هاوکارین، نەك تەنیا بە ناوو، هیوادارم لە بوارپێدانی کارکردنی هاوکارانم دا زێدەڕۆییشم نەکردبێ! ئەگەرنا دڵنیام کەمتەرخەمییم نەکردوەو کورتهێنان (تفريط)م نەبووە.

### ١٦- کار سپاردن بەخەڵك و ڕاهێنانیان لەسەر بەرپرسیارییەتی:

ئەمەش زۆر گرنگەو، پێم وایە ئەوە سیفەتێکی زەق بووە لە بەندەدا، هەندێك جار ڕەنگە زێدەڕۆییشم تێدا کردبێ و گلەییم هاتبێتە سەر، کە تۆ هەموو کارەکەت بەجێهێشتوە بۆ چەند کەسێك! بەڵام کاتێك کەسێك، یان چەند کەسێك، یان ئۆرگانێك، لەلایەن سەرووی خۆیەوە، متمانەی پێ دەکرێ و کاری پێ دەسپێردرێ، دەبێ ئەویش لە شوێنی ئەو متمانەیە بێ، ئەگەر نا دوایی هەڵوێستی لێ وەردەگیرێ! هەندێك

شتیش ڕەنگە هۆکارەکەی ئەوەبێ کە ئێمە کاروباری حیزبمان هەندێکجار واڕێکخستوە، کە دواتر خۆشمان گلەییمان لێی هەبووە، ئنجا لە ئەنجامی ئەوەش دا کە نەمویستوە پابەند نەبم بەو مەرجانەوە کە لەسەریان ڕێککەوتووین و، بەو پەیڕەوی نێوخۆییەوە، کە دامانناوە، لە ئەنجامی ئەوەدا، ڕەنگە پەڕاوێزیکی فراوانیش بۆ من نەمابێتەوە، کە ئاگام لە هەمووکارەکان بێ و، ڕاستەوخۆ کارەکان ئەنجام بدەم! !

١٧- دەستوەرنەدان لە کاروباری ئۆرگانەکان، مەگەر زۆر پێویست بێ و بۆ چارەسەر:

ئەمەش تاکو ڕاددەیەکی زۆر کارم پێکردوە، ئەو بەڕێزانەی کارمان پێکەوە کردوە، دەزانن، کە لەو بارەوە پێم وایە ئەزموونێکی باشمان هەبووە، پێشم وایە پێویستە بەردەوام چاو بە پەیکەری حیزب و سیستمی کاروبارمان دا بگێڕینەوە و، نابێ بە شێوەیەکی قاڵب بەستووانە و دۆگمایی (جمود) هەمیشە پابەندبین بە ڕابردووەوە و، بە جۆرێك شێواز و ئامڕازەکانی کاروبارمان تەماشا بکەین، کە پیرۆز (مقدّس)ن و، بیانکەینە بەشێك لە ئایین! چونکە ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە هۆکارێکی بێڕەزای دواکەوتن و بەجێمانەو، هەر کەس لە واقیع

دا نەژی و، دیلی مێژوو و ڕابردوو بێ، ناتوانێ واقیع بگۆڕێ و دەبێتە بەشێك لە مێژوو ! !

١٨- خێرا بەدەمەوە چوونی کێشە و گرفتەکان و نەوەخراندنیان:

پێویستە دەست و برد و دەستگەرمانە بەدەم کێشەو گرفتەکانەوە بچین، لەو بوارەش دا هەر کێشە و گرفتێك هاتبێتە پێش، مادام ئاگاداری بووبم و بە پێویستم زانیبێ، یەکسەر بە دەمیەوە چووم، کە بەس ئەوەش ڕاستە، نەك لێی بگەڕێی و گوێی لێ بخەوێنی، چونکە سەرەتا گرفتێکە، دواتر دەترووکێ و گەرا دادەنێ و زیاد دەکات و، دەبێتە پەنجا گرفت و، دواتر زەحمەتتر چاك دەبێ، پێشتریش باسمان کرد کە پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) کاتێك دەبیستێ پشتیوانەکان مقۆ مقۆیەکیان لە نێودا پەیدا بووە، لەسەر دابەشکردنی دەستکەوتەکانی جەنگی حونەین، یەکسەر کۆیان دەکاتەوە و قسەیان بۆ دەکات و بەرچاوڕوونیی پێویستیان پێ دەدات و، سەرەنجام زوییر بوون و نیگەرانییەکەیان نامێنێ و، بگرە زۆریش خۆشحاڵ دەبن، چەند جارێکیش ئەوە ڕوویداوە، کە سکاڵا و گلەیی ئەندامێکم پێگەیشتوە، لە هەر کەسێك بووبێ، مەکتەبی سیاسیی و بەرو خوار، یەکسەر بانگم کردوون و ڕووبەڕووم کردوونەوە و،

هەڵوێستی پێویستم وەرگرتوە، جاری واش بووە سەرەتا بەرپرس و پلەدارەكە نیگەران بووە، بەڵام دوایی زانیویەتی ك ئەوەی كراوە هەقە و ڕاستە !

١٩- لێكۆڵینەوە و وردبینیی و دووربینیی پێش بڕیاردان:

لێكۆڵینەوە و وردبینیی و دووربینیی پێش بڕیاردان و پەلە تێدانەكردنی، بەڵام دوایی قایم و مەحكەم بوون لەسەر بڕیارەكە، زۆر گرنگە مرۆڤ لە بڕیارداندا پەلە نەكات، بەڵام كە بڕیارێدا، قایم بێ لەسەر ئەو بڕیارە و، لەسەری بچێ و پێوەی پابەند بێ، زۆر جاری واش بووە، پاش بڕیاردانێك هەوڵی زۆر دراوە و فشار كراوە هەڵبوەشێنرێتەوە، بەڵام بەهەموو توانام هەوڵم داوە بە هەرچی تێبیچێ بڕیارەكە جێ بەجێ بكرێ و، بێگومان حاڵەتی ڕیزپەڕ و دەگمەنیش هەر هەن و دەبن.

٢٠- دەستپاكیی:

دەستپاكیی لە ماڵ و دارایی دا، لەو شتانەدا كە پەیوەندییان بە حیزب و كۆی ئەو خەڵكەوە هەیە، زۆر زۆر گرنگە، لەو بارەشەوە، پێم وایە سوپاس بۆ خوا، لە سەرووی شوبهە و گومانی خراپەوە بووین، نەك هەر بەندەش، بەڵكو

ئەو برایانەش کە پێکەوە کارمان کردوە و، ئەمەش زۆر گرنگە متمانە پێکرانی کۆی ئەندامان و، دڵنیابوونیان لە پاکیی سەرەوەی خۆیان و قەناعەت کردنیان، بەو هاوکارییە کەمەی دەیانکرێ.

سوپاس و ستایشیش بۆ خوا، کە چەندان جار ئەندازەی باشی هاوکاریی خێرخوازانم بۆلا نێرراوە، بەلأم تەنانەت دەستیشم نەگەیاندۆتێ و، یەکسەر بەرپرسی دارایی‌یم بانگ کردوە و تەسلیمم کردوە و، دوایش بۆ هاوکاریی هەندێك خەڵك ناچاربووم لەم و لەو قەرز بکەم و پاشان بیدەمەوە، هەرکات شتێکم هاتە دەست، کە بۆ ئەوە بشێ!! .

٢١- جیاوازیی نەکردن بە ئەندامان:

لەسەر بناغەی: ئەوەی دەیناسم و نایناسم، یان: کاتی خۆی لە فلأن و فیسار شوێن بووە و، لە ژێر فلأن و فیسار ناودا بووە، نابێ جیاوازیی بە خەڵك و ئەندامان بکرێ، پێم وایە، هەموو ئەوانەی هەڵس و کەوتمان لەگەڵدا کردوون، شاهێدییمان بۆ دەدەن کە بەبێ فەرق و جیایی، لە یەك مەسافە وەستاوم بەرامبەر بە هەمووان، بەلأم هەیە بە حوکمی پێگەکەی زیاتر تۆ دەبینێ و، هەیە بە حوکمی خۆشەویستییەکی تایبەتیی، زیاتر خۆی دێنێتە پێشەوە، بەلأم

مانای وانیە کە ئەوەی خۆشەویستیی زیاتر دەردەبڕێ، هەق یەکێکی دیکە بدەم بەو، چونکە دەبێ هەق و مافەکان بە دادگەرانە دابەش بکرێن، بەڵام کێت زیاتر خۆش دەوێ و، کێت کەمتر خۆش دەوێ؟ ئەوە شتێکی دیکەیە و، ئەوە شتێکی شەخسیی و سروشتییە، بەڵام نابێ کەسێکت کە زیاتر خۆش دەوێت و، یەکێکی دیکەت کە کەمتر خۆش دەوێ، ئەوە وات لێ بکات، ئەوەی خۆشترت دەوێ، مافی ئەوەی دیکەی بدەیە.

ئەوەی باسم کرد بیست و یەك (٢١) خاڵ بوو، لە ئەزموونی سەرکردایەتیی خۆم، هیوادارم کە بەرچاوڕوونی تێدا بێت بۆ هەموولایەك، دیارە وا حاڵیی بووم کە سەرکردایەتیی دەبێ بەو شێوەیە بکرێ، ئەوانە مەرجەکانی و ئەوانە سیفەتەکانی.

خوای پەروەردگار بە لوتف و کەڕەمی بێ سنووری خۆی، یارمەتییمان بدات، ئێمە بچینە ئاستێکی بەرزتر و باشترەوە، بۆ ئەوەی برشتمان زیاتر بێ و، خوای بەخشەر بەرەکەتی زیاتر بخاتە کاروبارمانەوە و، ئەو ئومێد و متمانەیەی کە خەڵك لەسەر ئێمەی هەڵچنیوە، لە شوێنی خۆیدا بێ و ڕۆژ بۆ ڕۆژێ لە زیاد بوونیش دابێ.

# دوا قسەم

لە دوا قسەم لەم کتێبەدا، چوار خاڵان دەخەمە ڕوو:

یەکەم: ئەم کتێبەم لە هەل و مەرجێکی یەکجار دژواردا ئامادەکردوە، کە هەرێمی کوردستان و عێراق و ناوچەکەش، لە قەیران و بۆشاییەکی قووڵی سەرکردایەتییکردنی ڕاستەقینەدایەو، خەڵك و جەماوەر بەگشتیی-جگە لە مشەخۆرانی شەریکەدز یان بەرماوخۆری، حوکمڕانانی خۆسەپێن و گەندەڵ و قۆرخکار- یەکجار پەست و بێزار و نائومێدە، بۆیە پێویستە زۆر بە جیددیی لـ ئەوەدابین، چۆن ئەو بۆشاییە پڕ بکەینەوەو ئەو قەیرانە چارەسەر بکەین؟

دووەم: پێویستە ئەندام و کادیرانی مشوورخۆر و دڵسۆزی کۆمەڵی ئیسلامیی ەگشتیی، زۆر بە ڕامان و قووڵبوونەوەوە ئەم بەرهەمە بخوێننەوەو، لێی

بەهرەمەنـد بـن و، وانـەزانن تـەنیا پەیوەسـتە بـە كەسـانێكەوە، كـە لـە ئاسـتی سـەركردایەتیی (قیـادة)دان، -بـەواتا تایبـەت و زاراوەییەكـەی-، بـەڵكو ئەم بەرهەمە بۆ هەموو لایەكە، چونكە:

١- سـەركردایەتییكردن (قیـادة) شـتێكی رێـژەیی (نسـبي)یـەو، هـەر لـە بەرپرسـی چـەند كەسـێكی كەمەوە، تاكو شار و دەڤەر و وڵاتێك دەیگرێتەوە.

٢- گریمان كەسێكیش هیچ جۆرە بەرپرسیارییەتێكی كەمیشـی نـەبێ، ئـەم كتێبـە هـەر دەیگرێتـەوە لەسۆنگەی ئەوەوە، كە هەموو كەس پێویستە بزانـێ بەرپرسانی-لەڕوانگەی ئیسلامەوە- كێن و چۆنن؟

سێیەم: با هیچكەس وانەزانێ، كە تەنیا تەوەری سێزدەیەم و كۆتـایی: {ئـەزموونی خـۆم لـە بـواری سـەركردایەتییكردن دا} پەیوەسـتە بـە ئـەزموونی تایبـەتیی بەنـدەوەو، بـیروڕا و تێگەیشـتنم لـە بـارەی {سـەركردایەتییكردن-قیـادة} ەوە! بـەڵكو كـۆی كتێبەكـە، بـە هـەموو تەوەرەكانییـەوە-بەگشـتیی- هەڵقوڵاو یان پەسندكراوی بەندەیەو، هیوادارم گرنگیی و بایـەخی شایسـتەی پێبـدرێ، بەتایبـەتییش، كـە بـەرەو كۆنگرەی چوارەممان دەچین.

چوارەم: خوا پشتیوان بێ، ئەم بەرهەمە دوای ئەم چاپ و بڵاوکردنەوە تایبەتەی، دواتر وەك سەرجەم کتێب و بەرهەمەکانم، بەشێوەی گشتییش چاپ و بڵاو دەکرێتەوە.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين، والحمد لله رب العالمين.

٢٦/٧/١٤٤٢ك – ١٠/١/٢٠٢١

# نێوەڕۆك

ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان
لە ڕۆژی دەستبەکاربوونیەوە
ئەم بەرهەمە ناوخۆییانەی لە شێوەی
زنجیرەی (ئاگایی) بە چاپ گەیاندووە:








مەوسوعەی (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە
نێوان وەحیی و واقیع دا) بە هەر پێنج
بەرگییەوە، بەرهەمی ئەو خولە
درێژخایەنەبوو کە ناوەندی ڕاهێنان و
گەشەپێدان بۆ پۆلێک لە کادیرانی
کۆمەڵی ئیسلامیی ئەنجامی دا






www.alibapir.com

ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان
Training & Development Centre

## زنجیرەی ئاگایی

ئەم زنجیرەیە، ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان بەشێوەی نامیلکە دەریدەکات، گرنگی بەپێگەیاندنی ئەندامان و کادیرانی کۆمەڵی ئیسلامیی دەدات، لە بەرفراوانکردنی ئاسۆی ڕۆشنبیری و بەرەودان بە بەرزکردنەوەی ئاستی مەعریفی و هۆشیارییان و پێشخستنی چۆنایەتی ئۆرگانەکان لەسەر بنەمای گرنگی و پێویستی قۆناغەکە.




www.alibapir.net
/alibapir
/MediaAmeerOffice
/alibapir1